2

له بلاوكراوه‌كانی سه‌نته‌ری حیكمه



# با دڵه‌كانمان به‌ قورئان ئاوه‌دان بكه‌ین





نوسینی

غه‌ریب عه‌زیز

چاپی سێیه‌م

2009ز - 1430ك

زنجیرەی بەرەو بەهاری قورئان

بەرگی یەکەم

# با دڵەکانمان بە قورئان ئاوەدان بکەین

نووسینی

غەریب عەزیز

پێداچوونەوەی

دەستێک لە مامۆستایانی سەنتەری حیکمە

ناوی کتێب: با دڵەکانمان بە قورئــان ئاودێر بکەین

نوسەر:  غەریب عەزیز

پێداچوونەوەی: دەستەیەك لە مامۆستایانی سەنتەری حیکمە

چاپی یەکەم: 2008 – 1429 – 2708

چاپی دووەم: 2009 – 1430 – 2708

تیراژ: 2000 دانە

ژمارەی سپاردن:

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (1730)ی ساڵی 2008 دراوەتێ

# أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥١ ﴾ سورة العنكبوت

﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمُنكَرَۖ
يَكَادُونَ يَسۡطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَاۗ قُلۡ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن
ذَٰلِكُمُۚ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٧٢ ﴾ سورة الحج

# پێشکەش

## پێشکەش بێ:

- به دایك و باوك و خوشك و برایه خۆشەویستەكانم.
- به خاتوو ئەسمائی هاوسەرم و منداڵە ئازیزەكانم.
- به شەیدایانی قورئانی مەزن و شەریعەتی خوا.

# پێشکەش کردن

الحمدلله القائل: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ والصلاة والسلام على الهادي المبعوث رحمة للعالمين القائل: ( اقرؤوا القرآن فإنه ياتى يوم القيامة شفيعاً لأصحابه) رواه مسلم.

وبعد:

هەر پێغەمبەرێك خوای گەورە ڕەوانەی كردبێ بۆ قەومێك موعجیزەیەكی پێداوە كە بە هۆیەوە كۆمەڵە كەسانێك بڕوایان پێ هێنابێ. بەلاٚم لەگەڵ مردنی ئەو پێغەمبەرە موعجیزەكە نەماوە. كەچی موعجیزەی پێغەمبەری خاتەم بریتی بووە لە قوڕئان  كە تا ڕۆژی دوایی بە موعجیزەیی دەمێنێتەوە، خوای گەورەش بەڵێنی داوە كە بیپارێزیت هەروەكو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ الحجر.

جا ئەركی سەرشانی مسوڵمان بەرامبەر بە قوڕئان بریتی یە لە خوێندنەوەی‌و لێ تێگەیشتن و لێ ووردبوونەوە و كارپێكردن و ڕاگەیاندنی.

بێگومان هەر كەسێكیش دەستی پێوەبگرێ سەرفرازی دونیا و قیامەت دەبێ، هەروەكو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (( القرآن شافع مشفع وماحل مصدق، من جعله أمامه قاده الى الجنة، ومن جعله خلف ظهره ساقه الى النار)) [1].

وە لە چەندان فەرموودەی تری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جەخت لەسەر گەورەیی و فەزڵی قوڕئان خوێندن و فێربوون و فێركردنی كراوەتەوە.

---

(1) حديث حسن رواه البزار وابن حبان في صحيحه.

به بەردەوامیش لە هەموو چاخ و سەردەمێکدا کەسانێك دەبن کە خوای گەورە وەکو سەربازی خۆی بەکاریان دەهێنێ بۆ پارێزگاری کردن لە ئایینەکەی و بڵاوکردنەوەی بە ناو خەڵکدا و خزمەتکردنی قورئانەکەی، بە ووتارو بەنوسین و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکانی.

کتێبخانەی کوردیش لەم ڕووەوە پێویستی بە دەوڵەمەندکردن هەیە، ئەم پەرتوکەش کە مامۆستا غەریب نوسیویەتی هەوڵێکە لەم بارەیەوە، وە من خوێندومەتەوە و پێیدا چومەتەوە، وە بە پێویستی دەزانم هەموو مسوڵمانێك بیخوێنێتەوە، چونکە زۆر زانیاری بەسوود لەبارەی کتێبی خودا بە زمانی شیرینی کوردی دەخاتە ڕوو، هەروەها وەڵامی زۆرێك لە پرسیارەکان دەداتەوە و چەندەها گومانیش دەڕەوێنێتەوە کە بونەتە بەربەستێك بۆ نەهاتنە پێشەوە لە قورئان وەکو فێربوون و لەبەرکردن و تێگەیشتن لە ماناکانی.

خودا نمونەی مامۆستا غەریب و هاوشێوەکانی زۆر بکات، بە چاکترین شێوەش پاداشتی بداتەوە.. آمـیـن.

أبوبكر قادر مصطفى

بەڕێوەبەری سەنتەری حیکمە

بۆ فێرکردن و پێ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له. وأشهد ان محمدا عبده ورسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾[1].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾[2].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾[3]

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

ئاشكرایە دوا سروش و بەرنامەی خوا بۆ سەر زەوی بە گشتی و ئێمەی مرۆڤایەتی بە تایبەتی، بریتیيە لە بەرنامەی ئیسلام، سەرچاوەی یەکەمیش لەم بەرنامەیە بریتیيە لە قورئانی مەزن. جا بەختەوەری جنۆکە و مرۆڤەکان

---

(1) سورة آل عمران: (102).

(2) سورة النساء: (1).

(3) سورة الأحزاب: (70- 71).

له دونیاو سەرفرازیان له دوارۆژ بەستراوەتەوە بە ئەندازەی شارەزابوون له ئیسلام و پابەندبوون و پەیڕەوی کردنی قورئانی مەزن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٥٥﴾ (1).

واته: (( وەئەم قورئانە بەفەرمان ناردۆتە خوارەوە. کەواتە ئێوەش شوێنی بکەن و پارێزکار بن تا ڕەحمتان پێ بکرێ )).

کەواتە: بە پێی ئەم پێوەرە قورئانی‌یە بابای هەڵگر و کارپێکەری قورئانی مەزن ڕێنموونی دەکرێ و بەزەیی خوای تاك و تەنیای بۆ مسۆگەر دەبێ و سەرفرازی ئێرەو ئەوێش دەبێ. بۆیە دەبێ زۆر ئاگادار بین بە ئەندازەی گرنگی دانمان بە قورئانی مەزن گرنگی دانە بە خوای گەورە، وە بە ئەندازەی کەمتەرخەمی‌و گوێ نەدانمان بە قورئانی مەزن گوێ نەدانە بە خوای تۆڵەستێن.

جا بە هیوای ئەوەی هەموومان بەرامبەر بە قورئانی مەزن لە ئاستی پێویست دابین و کەمتەرخەم نەبین لە خوێندنەوەو لەبەرکردن و لە خزمەت کردنی.

**نوسەر**

**بەهاری 1420/1999**

**کوردستان – هەولێر**

---

(1) سورة الانعام: (155).

# ڕێ خۆشکردن

## لە سەرەتادا چەند تێبینییەکی پێویست

1- هەندێك لەو فەرموودانەی لەم زنجیرەیەدا هاتوون و لە لایەن هێندێك زاناوە بە بێ هێز (ضعیف) لە قەڵەم دراون، بەڵام لە لایەن هێندێکی تر تەحقیق و تەخریجی تریان بۆ کراوە و گەیاندوویانەتە پلەی (حسن) یان (صحیح) ئێمەش هێناومانەتەوە و ئاماژەمان بە چۆنیەتی تەخریجەکەشی کردووە.

2- لەبەرئەوەی نوسینی ئەم زنجیرە پەرتووکە زادە و هزری مرۆڤە، بۆیە کەم و کورتی و هەڵەی لەوانەیە تێدا بێت، چونکە ئەوەی بێ لەکە و هەڵە بێت تەنها کتێبی خوای گەورەیە[1] کە قورئانە. جا لە بەڕێزتان داوا کارم بە گەورەیی خۆتان لە هەبوونی هەر هەڵەیەك ئاگادارمان بکەنەوە، منیش لە لایەن خۆمەوە لە هەبوونی ئەو هەڵانەی هەستم پێ نەکردوون و لەگەڵ شەریعەتی خوا تێك دەگیرێن پەشیمانم. پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە هەڵوێستی ئێوە بەرامبەر من و هەر مسوڵمانێکی تر دەفەرموێت: (الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ يَكُفُّ عنه ضَيْعَتَهُ وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِه)[2].

---

(1) خوای گەورە سەبارەت بە کتێبی خۆی دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء.

(2) رواه ابو داود (4918)، وابن وهب في الجامع (ص37)، والبخاري في الادب المفرد (239) من حديث ابي هريرة وإسناده حسن، والطبراني في الاوسط (2135)، والبزار (3297)، والقضاعي في مسند الشهاب (124، 125) باسناد حسن من حديث انس رضي الله عنه.

واته: (ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره، برای ئیمانداره، کاروبارەکانی ژیانی بۆ کۆدەکاتەوەو یارمەتی دەدا، وەلەپاش مله بەرگری لیٚ دەکاو دەیپاریزیٚو به خراپه باسی ناکا).

3- هەموو ئەو سەرچاوانەی سوودم لیٚ وەرگرتوون بۆ ئامادەکردنی ئەم زنجیرەیه که له پێنج بەرگ پێك هاتووه له بەرگی کۆتایی ئامازەیان پیٚ دەکەین.

4- ئەم زنجیرەیه جگه له بەرگی سێیەم چەند ساڵێك بەر له ئێستا نوسراوەو کۆکراوەتەوە، بەلاّم ئەوەنده هەیه پێداچوونەوەی بۆ کراوەو لێی کەم و زیاد کراوه.

# بەشی یەکەم

ئەم بەشە پێکهاتووە لە چەند بابەتێك کە هەریەکەیان بۆ چوونە ناو دەروازەی قورئانی مەزن گرنگەو سەرەتایەکە بۆ ناسینی، کە ئەمانەن:

1. پێناسەی قورئانی مەزن
2. ناو و سیفەتەکانی قورئان
3. پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئانی پایەدار
4. نموونەکان لە قورئانی مەزن (الأمثال في القرآن)
5. قورئانی مەزن و زانستی نوێ
6. قورئان و فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم -
7. قورئانو ئیمان
8. حوکم کردن بە قورئانی مەزن لە فەرمانڕەوایەتیدا
9. دوعا و چارەسەری بە قورئانی مەزن

## یەکەم: پێناسەی قورئانی مەزن

قورئانی مەزن بە پیت (حرف) و واتایەکانی (معانیه) فەرموودەی خوای پەروەردگارە و لە لایەن خوای گەورە لە ڕێگەی (جبریل)ەوە بە سروش بۆ نێردراوەکەی محمد صلی الله علیه وسلم ڕەوانە کراوە، خوێندنەوەی خواپەرستی‌یە و پاداشتی زۆری لە سەرەو ڕێنموونی دەکات بۆ ڕاسترین و چاکترین ڕێگا، وە لە پەڕاوەکاندا لە مابەینی هەردوو بەرگی موصحەفی بەردەستمان نوسراوەتەوە، نە لێی زیاد کراوە، وە نە لێی کەم کراوە، سەد و چواردە (114) سوڕەتی لەخۆ گرتووە، بە سوڕەتی (الفاتحة) دەست پێ دەکات و بە سوڕەتی (الناس) کۆتایی دێت.

## دووەم: ناو و سیفەتەکانی قورئان

چەندان ناو و سیفەتی بەرز و مەزن بۆ قورئانی بەڕێز لە قورئان و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتوون، جا لەبەر گرنگی‌یان دەبێ تێبینی ئەو ناو و سیفەتانە بکەین و لە لایان بوەستین و لێیان ڕابمێنین و سەرنجیان بدەین و ژیانیان لەگەڵ ببەینە سەر، ئەمەش بە کۆکردنەوەو ئامادە کردنی هەرچی هەست و نەستێك لە گیان و لاشەماندا هەیە، ئەگەرنا داواکاری ئەو قورئانە و ڕۆڵ و گرنگی لە ژیانماندا نازانین و ناتوانین بە پێی پێویست هەڵس و کەوتی لە گەڵ بکەین و پەی بە نهێنی و زانیاری‌یە زۆرەکانی ببەین. جا هێندێك لە زانایان دەڵێن قورئان چوار (4) ناوی هەیە کە (الکتاب، القرآن، الفرقان، الذکر)ن، بەڵام ئەوانیتر سیفەتن بۆ قورئان، وە ئێمە لێرەدا هێندێك لەم ناو و سیفەتانە دەژمێرین و لە سەرەتادا پێنجیان لێ باس دەکەین:

1- ڕۆح (الروح):

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ وَلَـٰكِن جَعَلْنَـٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1].

واتە:(( وەئەی پێغەمبەر -صلی اللە علیە و سلم- ئا بەو شێوەی کە گوتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە، کە ژیان بەخشە بە ڕۆح و گیان و عەقڵ، تۆ نەتدەزانی قورئان چیەیە و ئیمان چیەیە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە ڕووناکی و نورێك کە هیدایەت و ڕێنمونی هەر کەس کە بمانەوێت لە بەندەکانمانی پێ دەکەین - ئەوانەی دڵی بۆ دەکەنەوە و بە چاکی گوێی بۆ دەگرن، بێگومان تۆ (پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم) ڕێ نیشاندەریت و ڕێنمونی دەکەی بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست)).

بەڵێ؛ ئەم قورئانە مەزنە ڕۆحە و ژیان دەبەخشێ بە جەستەکان، مرۆڤەکان بەبێی ئەم قورئانە مردوون.. مردنی دڵ و دەروون و هەست و نەستیان، مردنی گەورەترین ئەندام لە لاشەیان، بەڕاستی کارەساتێکی زۆر گەورەیە! وە کەسانێك لەم کارەساتە دووا نەهاتووە ڕزگاریان دەبێ کە دەرگای دڵەکانیان بۆ قورئانی بەڕێز والآ بکەن و لە هەرچی ژەنگ و ژاری گوناه و سەرپێچی خوای گەورە هەیە پاکی بکەنەوە و بە گەڕانەوە بۆ لای خوا و تێگەیشتن و ڕامان لە قورئانی مەزن قفڵە لێدراوەکانی بشکێنن. وە ئەگەر سەرنجی ئیمانداره پێشینەکان بدەین دەبینین بە ڕۆحی ئەم قورئانە مەزنە گۆش کرابوون بۆیە دەیانزانی خوێندنەوە و لەبەرکردن و کار پێ

(1) سورة الشورى: (52).

کردن و خزمەت کردنی چ ژیان و سەربەرزی و خۆشییەکیان لە دونیا پێ دەبەخشێ و چەند دواڕۆژیان پڕشنگدار و پڕ لە خێر و پاداشتی خوایی دەکات.

2- نور و ڕوناکی (النور):

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَا ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾[1].

واتە: ((جا کەواتە تا زووە باوەڕ و ئیمان بهێنن بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی و بەو نور و ڕۆشنایییەی ناردوومانەتە خوارەوە-کە قورئانە- وە خواش شارەزا و ئاگایە بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)).

قورئانی مەزن بۆ ئیمانداران نور و ڕووناکییە و لە دڵ و سینە و ڕوویاندا دەدرەوشێتەوە، وە بێ گومان بە زیادبوونی ئیمانەکەیان ئەو ڕووناکییە زیاتر و درەوشاوەتر دەبێ و دەبێتە سایە و سێبەری خێر لە ژیانیاندا و ڕێنمونی بۆ خۆیان و دەوروبەریان.

بەڵێ؛ ئەم نورە ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای مرۆڤەکانە و دەتوانین بە کاری بهێنین بۆ دیتن و ئینجا لابردنی هەرچی پەرچ و لەمپەر و نەخۆشی و ناخۆشییەك کە دووچارمان دەبێ و دێتە ڕێمان.

خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾[2].

---

(1) سورة التغابن: (8).

(2) سورة الانعام: (122).

واتە: (( ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو بەهۆی شوێن نەکەوتنی قورئان و بێ باوەڕییەوە -ئینجا- بە هۆی ئیمانەوە- زیندوومان کردەوە و نور و ڕووناکییەکمان بۆ ساز کرد لە ژیانییدا -کە قورئانە- لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵس و کەوتی پێ دەکات -هاندەریەتی بۆ کردنی هەموو چاکەیەك و دەیگێڕێتەوە لەهەموو خراپەیەك، ئایا ئەو کەسە- وەکو ئەوە وایە کە لەناو تاریکییەکاندا چەقیوەو لێی دەرناچێ، هەروەها ئا بەو شێوەیە کە دەبینرێت بێبڕواکان ئەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن بۆیان ڕازێنراوەتەوە)).

3- شیفا ( الشفاء ):

خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿...قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ...﴾[1].

واتە: (( ئەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- پێیان بڵێ: ئەو قورئانە بۆ ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە هیدایەت و ڕێنموونی و شیفایە و چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشیەکان دەکات )).

وەدەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾﴾[2].

واتە: ((ئێمە لە قورئان ئایەت و سورەتێك دادەبەزێنین، کە ببێتە هۆی شیفاو- چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکان- هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش بۆ ئیمانداران، بۆ ستەمکار و خوانەناسانیش تەنها زیادکردنی زەرەرو زیان نەبێت هیچی تر نییە و هیچ بەهرەو سودێکی لێ نابینن)).

---

(1) سورة فصلت: (44).

(2) سورة الاسراء: (82).

4- فورقان و جياكەرەوە ( الفرقان ):

خواى ميهرەبان دەفەرمویٚ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١ ﴾[1].

واتە: ((خودا بەرز و مەزنە و هەر ئەو شايستەى خێر و پيت و فەڕ و بەرەكەتی زۆرە كە قورئانی دابەزاندوە تا ببێتە جياكەرەوەى ڕاست و ناڕاست، بۆ سەر بەندەى خۆى محمد -صلى الله عليه و سلم- تا ببێتە هۆشياركەرەوە وبێداركەرەوەى دانيشتوانی جيهان لە هەموو سەردەمێكدا)).

بەڵێ؛ بەهۆى قورئانەوە ئيمان و كوفر، هەق و ناهەق، ڕووناكی و تاريكی، چاك و خراپ، ڕێنموونی و گومڕايی لێك جيادەكرێنەوە، هەر تەنها قورئانی مەزن ڕێنمونی كارە بۆ ڕێگای ڕاست، ئەوانی تر هەرچ بن وە لە هەر كوێ بن بەتاڵ و گومڕايی و تاريكين و مرۆڤەكان بەرەو هەڵدێر و نزمايی دەبەن و لەماڵ وێرانی دونيا و شەرمەزاری دواڕۆژ هيچی تريان بەدواوە نييە.

5- بە پيت و فەڕو بەرەكەت (مبارك):

خواى گەورە دەفەرمویٚ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾[2].

واتە: (( ئەم قورئانە كتێبێكی بە پيت و فەڕ و خێری نەبڕاوەيە، دامان بەزاندووە، ڕاستی كتێبەكانی پێشوو دەسەلمێنێت، وە ناردوومانە تا شارە دێرينەكە -مەكەى پيرۆز - و دەوروبەری داچڵەكێنێت و بانگيان بكات بۆ ئيسلام، جا ئەوانەى كە باوەڕ بە ڕۆژی دوايی دەهێنن، بڕوا بە قورئانيش

(1) سورة الفرقان: (1).
(2) سورة الانعام: (92).

دەهێنن و لە سەر نوێژەكانیان بەردەوامن و هەمیشە لەكاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن)).

ئای لە پیت و فەڕ و بەرەكەتی قورئانی بەرز و بەڕێز!! چەندە گەورە و مەزنە.. چەندە بەها گران و پڕشنگدارە.. چەندە لایەق و شایەن بە خۆیەتی. چۆن وا نەبێ ئەی موبارەك نییە لە سەرچاوەكەیەوە كە فەرموودە و كەلامی خوای گەورەیە؟! وە موبارەك نییە لە شوێنی تۆماركردنییەوە كە (لوح المحفوظ)ە؟! وە موبارەك نییە لە هەڵگرەكەیەوە بۆ سەر زەوی كە (جبریل الامین)ە سەلامی خوای لێ بێ؟! وە موبارەك نییە لەوەی لە كاتی دابەزین و ڕەوانەكردنی فریشتە پاك و بێ گەردەكان چوار دەوری دەدەن؟! وە موبارەك نییە لەوەی كە ئەوەی لە زەوی وەری دەگرێ كە پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم؟! وە موبارەك نییە لەوەی كە تێیدا جێگیر دەبێ كە دڵی پێغەمبەری خوایە و شەیتانی نەفرەت لێكراو هیچ پشك و بەش و مافی بە سەر ئەو دڵەوە نەبووە؟! وە موبارەك نییە لەوەی كە ووشەكانی كورت و پڕ مانان؟! وەموبارەك نییە لە قەبارە بچوكەكەی و زانستە زۆر و لە بن نەهاتووەكەی؟! وەموبارەك نییە لە شوێنەوار و كاریگەرییەكەی كە دەتوانێ - بە ئیزنی خوا - دەوروبەر بگۆڕێ بەڵام دەوروبەر ناتوانێ ئەو بگۆڕێ؟! ئەمانە و چەندان پیت و فەڕ و موبارەكی تریش كە لەم قورئانەدا دەدرەوشێنەوە و باس و خواسی كۆتایی نایەت.

6- كتێب (الكتاب): ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾ البقرة.

7- ڕێنموونی (هدى): ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾ البقرة.

8- ئایەت و بەڵگەی ڕوون و ئاشكرا و دیار (آيات بينات): ﴿ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ءَايَٰتِۢ بَيِّنَٰتٖۖ وَمَا يَكۡفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقُونَ ۝٩٩ ﴾ البقرة.

9- هەق و ڕاست (الحق): ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾ ﴾ البقرة.

10- پەت و یارمەتی خوا (حبل الله[1]): ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ آل عمران.

11- ڕوونکردنەوە (البیان): ﴿ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ آل عمران.

12- ئامۆژگاری (موعظة): ﴿ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ آل عمران.

13- قورئان (القرآن): ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء.

14- ڕوونکەرەوە (مبین): ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ ﴾ المائدة.

---

(1) ئیبن جەریری طبری لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (حبل الله) بریتییە لە قورئان. جامع البیان (31/4).

15- چاودێرو بەسەر ڕاگەیشتوو (مهیمن): ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.

16- دەستور و شەریعەت (شريعة): ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.

17- ڕێگەیەکی ڕوون (منهاج): ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ ﴾ المائدة.

18- پەیام (رسالة): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة.

19- ڕوون کەرەوە (المفصل) ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًاۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ الأنعام.

20- ڕاستی (صدق): ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ الأنعام.

21- بەداد (عدل): الأنعام (١١٥).

22- بەڵگەی ڕوون (بينة): ﴿ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَاۗ سَنَجْزِي ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ الأنعام.

23- ڕەحم و بەزەیی (رحمة): الأنعام (١٥٧).

24- بەرچاو ڕۆشنی (بصائر): ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَاۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾ الأعراف.

25- قسەی خوا (كلام الله): ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾ التوبة.

26- چاکترین چیرۆك و بەسەرهات (أحسن القصص): ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾ یوسف.

27- هەواڵی پەنهان و غەیب (أنباء الغیب): ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ یوسف.

28- یاد (ذكر): ﴿ وَمَا تَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ یوسف.

29- فەرمان (حكم): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ الرعد.

30- زانست (علم): الرعد(٣٧).

31- ڕاگەیاندن و جاڕ (بلاغ): ﴿ هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٥٢﴾ ﴾ ابراهیم.

32- مەزن (العظیم): ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر.

33- چاك و باش (خیر): ﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا خَيْرًا لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ النحل.

34- ڕێنموونی کار (هادی، یهدي): ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الاسراء.

35- ڕاسترین ڕێباز و بەرنامە (أقوم): الاسراء: (﴿٩﴾).

36- مژدەدەر (بشير): الاسراء: (﴿٩﴾).

37- پایەدار (القيم): ﴿ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ ﴾ الكهف.

38- چاکترین لێکدانەوە و تەفسیر (أحسن التفسير): ﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ الفرقان.

39- گوتەی خوا (القول): ﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ القصص.

40- لێزان و کاربەجێ (حكيم): ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ ﴾ لقمان.

41- چاکترین (أحسن): ﴿ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ الزمر.

42- چاکترین فەرموودە (أحسن الحديث): ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزمر.

42- لێکچوو، وەك یەك (متشابه). الزمر:(٢٣).

44- دووبارە بوەوە (مثاني). الزمر:(٢٣).

45- یادی خوا (ذکر الله). الزمر:(٢٣).

46- ڕێنموونی خوا (هدی الله). الزمر:(٢٣).

47- مژدەدەر و ترسێنەر (بشیر و نذیر): ﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ ﴾ فصلت.

48- بەدەسەڵات و بە عزەت (عزیز): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ ﴾ فصلت.

49- دابەزێنراو لە ئاسمانەوە بۆ زەوی (تنزیل): ﴿ لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ ۖ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت.

50- تەرازوو (میزان): ﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الشوری.

51- بەرز و بڵند (عليّ): ﴿ وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ الزخرف.

52- ئاسانکراو (یسر): ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الدخان.

53- دەدوێ. دواو (ینطق): ﴿ هَٰذَا كِتَابُنَا يَنْطِقُ عَلَيْكُمْ بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنْسِخُ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الجاثیة.

54- ڕێگەی ڕاست و ڕێك (طريق مستقيم): ﴿ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأحقاف.

55- سروش (وحي): ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾ النجم.

56- هەواڵ (نبأ): ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ ﴾ القمر.

57- حیکمەت و لێزانییەکی تەواو (حكمة بالغة): ﴿ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ ﴾ القمر.

58- ڕێزدار و بەڕێز (كريم): ﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ الواقعة.

59- فەرمان (أمر): ﴿ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾ ﴾ الطلاق.

60- بەڵگە و ئایەتی خوا (آيات الله): ﴿ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ﴾ الطلاق.

61- وەبیرهێنانەوە (تذكرة): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ الحاقة.

62- دڵنیا بەخش (يقين): ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ ﴾ الحاقة.

63- سەیر و سەرسوڕهێنەر (عجيب): ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ ﴾ الجن.

64- ڕێ ڕاست (رشد): ﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ٢﴾ الجن.

65- پەڕاوی بەڕێز (صحف مكرمة): ﴿فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ١٣﴾ عبس.

66- بەرز و پاك (مرفوعة مطهرة): ﴿مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ ١٤﴾ عبس.

67- شكۆدار (مجيد): ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١﴾ البروج.

68- پارێزراو، پارێزگاری لێكراو (محفوظ): ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢﴾ البروج.

قرأ الجمهور ﴿مَّحۡفُوظِۭ ٢٢﴾ بالجر على أنه نعت للوح، و قرأ نافع - وهو من القراءآت المتواترة- برفعه (محفوظٌ) على أنه نعت للقرآن: أي بل هو قرآن مجيد (محفوظٌ) في لوح[1]. زۆربەی زانایان ووشەی (مَّحۡفُوظِۭ)یان بە لە ژێری (مَّحۡفُوظِۭ) خویندۆتەوە كە دەبێتە سیفەت بۆ لەوح، وە نافع - كەیەكێكە لە حەوت جۆرە خوێندنەوە تەواتورەكانی خوێندنەوەی قورئان- بە لەسەری (محفوظٌ) خویندۆتەوە كە دەبێتە سیفەت بۆ قورئان. بە واتایەكی تر تەفسیری ئایەتەكە دەبێتە: بەڵكو ئەمە قورئانێكی شكۆدارو پارێزراوەو لە لەوح نوسراوە.

69- پەڕاوی پاك و خاوێن (صحف مطهرة): ﴿رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ٢﴾ البينة.

70- نوسراوی بە نرخ (كتب قيمة): ﴿فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ٣﴾ البينة.

**تێبینی:** لەوانەیە سیفەتی تریش هەبن بەڵام من هەر ئەوەندەم زانی و بۆم كۆكرایەوە.

---

(1) بڕوانە: تفسير الفتح القدير للشوكاني (5/414).

## سێیەم: پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئانی پایەدار

مسوڵمانان دەبێ باوەڕیان وابێ کە خوای گەورە ئەم قورئانەی لە هەموو ڕوویێکەوە پاراستووە و هەرچی تێیدایە هەقە و فەرموودەی خوای گەورەیە و دوورە لە کەم و کوڕی و تا دونیا بە دونیایە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. وە دەتوانین بڵێین ئەو قۆناغانەی کە خوای گەورە قورئانی پێ پاراستووە- بەکورتی- ئەمانەن:

قۆناغی یەکەم: پاراستنی قورئان لە پارچەی پارێزراو (لوح المحفوظ) کە ئەویش خۆی پارێزراوە:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾ ﴾[1].

واتە:(بەڵکو ئەوە-ی کە بە درۆی دەزانن- قورئانێکی شکۆمەند و گەورەیە، لە لەوحێکی پارێزراو دایە).

وەدەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾[2].

واتە: (وە بەڕاستی ئەم قورئانە لە لای ئێمە لە تابلۆی پارێزراو دایە کە زۆر بەرز و بڵندە و پڕە لە دانایی).

قۆناغی دووەم: پاراستنی خوا بۆ قورئان لەکاتی دابەزاندنی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی محمد صلى الله عليه وسلم:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ ﴾[3].

---

(1) سورة البروج: (21-22).
(2) سورة الزخرف: (4).
(3) سورة الجن (26-27).

واتە: (هەر خوا زانایە بە نهێنییەکانو کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا، مەگەر پەیامبەرێك کە لێی ڕازییە -بێ گومان لە هەموو پێغەمبەران ڕازییە- بەڕاستی خوا لەبەردەمی و پشتی قورئان لەکاتی دابەزاندنیدا پاسەوان لە فریشتەکان دەنێرێ).

کەواتە کاتێك جبریل -سەلامی خوای لێ بێ- بە فەرمانی خوا قورئانی بۆ پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم دادەبەزاند فریشتەکان لەگەڵیدا بوون و پاسەوانیان لەوە دەکرد کە دادەبەزیو چوار دەوریان دەدا، وە نەیاندەهێڵا جنۆکە و شەیتانەکان دەستکاری و دزەی زانیارییەکانی بکەن.

**<u>قۆناغی سێیەم</u>: پاراستن و کۆکردنەوەی لە دڵی پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم:**

قال سعيد بن جبير، عن ابن عباس في قوله تعالى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾﴾[1]. قال: "كان رسول الله -صلى الله عليه وسلم- يعالج من التنزيل شدة، وكان مما يحرك شفتيه. فقال ابن عباس: فأنا أحركهما لكم كما كان رسول الله -صلى الله عليه وسلم- يحركهما، وقال سعيد: أنا أحركهما كما رأيت ابن عباس يحركهما، فحرك شفتيه فأنزل الله تعالى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾[2]. قال: جمعه له في صدرك، وتقرأه. ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾[3]. قال فاستمع له وانصت: ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾[4]. ثم إن علينا أن نقرأه. فكان رسول الله صلى الله عليه وسلم بعد

---

(1) سورة القيامة: (16).

(2) سورة القيامة: (16-17).

(3) سورة القيامة: (18).

(4) سورة القيامة: (19).

ذلك اتاه جبريل استمع، فاذا انطلق جبريل قرأه النبي صلى الله عليه وسلم كما قرأه" [1].

واته: " له سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس –خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ– گوتویەتی: سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾﴾ پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– بە هاتنەخوارەوەی قورئان زۆر ناڕەحەت دەبوو –لەبەر غەمی لەبیرچوون و وەرنەگرتنی بەڕێکی– بەو هۆیەوە لێوەکانی زۆر دەجولاند، جا عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: منیش لێوەکانم دەجولێنم بەو شێوەیەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لێوەکانی دەجولاند، وە سەعید دەڵێ: منیش لێوەکانم دەجولێنم هەروەکو بینیم ئیبنو عەبباس لێوەکانی دەجولاند، ئیدی لێوەکانی جولاند. ئینجا خوای گەورە ئەم دوو ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ قورئانت پێ لەبەردەکەین و دەیخوێنیتەوە –لەبیرت ناچێت– ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ ئینجا کاتێك قورئانمان بۆ خوێندیەوە –بەهۆی جبریلەوە– تۆش شوێنی خوێندنەوەی ئەو بکەوە ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ ئینجا دڵنیابە لەسەر ئێمەیە قورئان خوێندنەوەی تۆ –بەئاسانی– دوای ئەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە جبریل دەهات بۆ لای گوێی لێ دەگرت، دوای ڕۆیشتنی بەو شێوەیەی جبریل قورئانەکەی دەخوێند پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەیخوێندەوە".



(1) رواه البخاري: (5).

**<u>قۆناغی چوارەم</u>: پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئان لەکاتی ڕاگەیاندن و خوێندنەوەی لە لایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بەسەر بەندەکانی خوا:**

**خوای گەورە و باڵادەست خۆی سەرپەرشتی کردووە لە گەیاندنی دەقاودەقی ئەم قورئانە لە پێغەمبەرەوە –صلی الله علیه وسلم– بۆ ئێمە، وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾[1].**

**واتە: (سوێند بە خوا ئایەتەکانی قورئانمان بە شوێن یەکدا بۆ ناردن تا پەند وەربگرن و بیربکەنەوە).**

**بەڵێ: هەر ئەوەش کاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بووە، بەڵکو بە یەکێك لە مەرجەکانی پێغەمبەرایەتی دانراوە کە بەبێ زیادو کەم وەکو خۆی ڕایبگەیەنێ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾[2].**

**واتە: (ئەی پێغەمبەر ڕایگەیەنە –بەخەڵك– ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت هێنراوەتە خوارەوە، وە ئەگەر وانەکەی ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووە و بەجێت نەهێناوە، وە خوا تۆ دەپارێزێ لە خەڵکی –کە بتکوژن– بێگومان خوا ڕێنموونی بێ بڕوا و کافران ناکات).**

(1) سورة القصص: (51).

(2) سورة المائدة: (67).

<u>قۆناغی پێنجەم</u>: پاراستنی خوا بۆ قورئان، دوای ئەوەی لەلایەن پێغەمبەرەکەی محمد صلى الله عليه وسلم ڕاگەیەنرا، تا دونیا بە دونیایە:

خوای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ  ﴾[1].

واتە: (بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین).

ئەم پاراستنەی خوای گەورەش بۆ قورئان سێ (3) کار لەخۆی دەگرێ:

**کاری یەکەم**: پاراستنی پیتو ووشەکانی بەتەواویو دەقاودەقو بەو شێوەیەی بۆ پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم دابەزیوەو ئێستاکە لەبەر دەستی ئێمە دایە تاکو ڕۆژی دوایی.

**کاری دووەم**: پاراستنی ڕوونکەرەوەی قورئان کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

**کاری سێیەم**: پاراستنی هەڵگرانی قورئان و هێشتنەوەی ئەوانەی ڕایدەگەیەنن هەتا هاتنی قیامەت، کە خوای گەورە چەند کەسانێك لە بەندەکانی دیاری دەکاو هەڵیاندەبژێرێ بۆ کۆکردنەوەی قورئان لەسینەیاندا بەجۆرێك ووشەکانی چاك بخوێننەوەو پیتەکانی جوان دەربڕن.

ئینجا خوای گەورە بە هەر پێنج (5) قۆناغ قورئانی مەزنی لە گۆڕانکاریو دەستکاریو زیادو کەم تێ خستن پاراستووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾[2].

---

(1) سورة الحجر: (9).

(2) سورة فصلت: (42).

واتە: (ناهەقی و بەتاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستا و نە لە دواڕۆژدا، نە بە زیادکردن نە بە کەم کردن –چونکە– نێردراوەتە خوارەوە لەلایەن خوایەکی کاردروستی ستایشکراوەوە).

بەڵێ: خوای پەروەردگار کەسانێکی لە بەندەکان لە چینی سەحابە و دوای ئەوان و ئێستا و لە مەودواش بۆ لەبەرکردنی قورئان هەڵبژاردووە و ئەم ڕێزەی لێ ناون. دەجا ئێمەش با هەوڵدەین لەو ئاستە دابین و یەکێك بین وەك ئەو جوامێرانە و بەر ئەم شەڕەفە بەرزە بکەوین و قورئانی پایەدار لەبەربکەین و کاری پێ بکەین و زانستەکانی بڵاوبکەینەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾[1].

واتە:(نەخێر ئەم قورئانە قسەکانی تۆ نییە (بەڵکو چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکرای خوای گەورەن لە دڵ و دەروون و سینەی کەسانێکدایە کە لەلایەن خواوە زانستیان پێ بەخشراوە، وە تەنها ستەمکاران دان نانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا).

(1) سورة العنكبوت: (49).

## چوارەم: نموونەکان لە قورئانی مەزن (الأمثال في القرآن)

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾[1].

واتە: ((سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو نموونەیەکمان بۆخەڵکی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی بیرێك لە ڕاستییەکان بکەنەوە و تێ بگەن)).

نموونە (مثل): بریتی‌یە لە چەند قسەیەکی ڕێك و پێك هەڵدەستێ بە وێك چواندنی شتێك بە شتێکی تر، واتە: وێك چواندنی بارودۆخ و حاڵەتی دووەم بە بارودۆخ و حاڵەتی یەکەم، جا یەکێك لە شێوازەکانی قورئانی مەزن لە دواندندا هێنانی نموونەیە، بێگومان نموونە لە قسەکردندا گرنگی‌یەکی تایبەت و ئەرکێکی گەورەی هەیە کە ناتوانرێ نکۆڵی لە سوودەکەی بکرێ، وەکاریگەری‌یەکی ئەوتۆی هەیە لە سەر دڵ و دەروونی گوێگران، ئەمەش بە هۆی بەخشینی ئەو واتا ڕێك و پێکەی کە لە دەروونی جێگەی بۆ دەکرێتەوە لە مابەینی دوو بارودۆخدا.

دیارە ئامانجی سەرەکی خوای گەورەش لە هێنانی ئەم نمونانە یاد خستنەوە و ئامۆژگاری و پەند وەرگرتن و چەسپاندن و نزیك خستنەوەی مەبەستە بۆ عەقڵ و بیر و هۆش بە شێوەکێشانی ئەو بابەتانە لە شێوەی بیندراو و دیاردەییدا، چونکە شتی هەست پێ کراو زیاتر و باشتر لە بیر و هۆشی ئادەمیزاددا جێگیر دەبێ و زیاتر ویژدانی پێ دادەسەکەنێ و ئارام دەگرێ.

---

(1) سورة الزمر: (27).

**نموونەکانی قورئانی بەڕێز دوو جۆرن:**

**جۆری یەکەم:** نموونەی ئاشکرا (ظاهر)ن و لە وێچوو (المشبَّه) و لەوچوو (المشبَّه بە) پێکهاتوون‌و پەیوەندیان لە نێواندا هەیە. وەکو ئەم دوو نموونەی قورئانی مەزن کە چۆن پەروەردگارمان حاڵ و چۆنیەتی بە ناو هەڵگرانی قورئانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

**نمونەی یەکەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾(١)

واتە: (( دەنگ و باسی ئەو کەسەیان بۆ بگێڕەوە کە زانا و ئاشنامان کرد بە ئایەت و ئایینی خوا و لە دوایی وازی لێ هێنا و فەرامۆشی کرد و ئیمان و باوەڕی لە خۆی دامالّی. ئەو کاتە شەیتان دوای کەوت و سەرگەردان بوو، ئەگەر بمانویستایە بەو زانین و ئایەتانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام خۆی نەیویست و بووە بەندەی دونیا و بە دوای ئارەزووەکانی خۆی کەوت، نموونەی ئەو کەسە وەك نمونەی سەگێکە ئەگەر پەلاماری بدەیت و بیتارێنی یان وازی لێ بهێنێ و هیچی لێ نەکەیت، هەر زمانی دەرهێناوە و هەناسە بڕکێیەتی‌و ماندووە... ئەوە وێنەو نموونەی گەل‌و کۆمەڵێکە کە بڕوایان

---

(١) سورة الاعراف: (175-177).

نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمەو بەدرۆیان زانی، جا تۆ ئەو نمونەو بەسەرهاتەیان بۆ باس بکە بەڵکو بیربکەنەوە، زۆر بەدو خراپە وێنەو نمونەی ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانمان نەهێناو بەدرۆیان زانی.. وە ئەوانە ستەمیان لە دەروون و نەفسی خۆیان کردووە)).

بە ڕاستی ئەمە وێنەو نموونەی کەسێکی سیفەت سەگانەیە کە خوای گەورە ئایەتەکانی خۆی پێ ببەخشی و چاکەی لەگەڵ بکات و فێری زانستی بکات بەڵام ئەو بەد نمەك بێ و کاریان پێ نەکاو شوێن هەوا و ئارەزووی خۆی بکەوێ.. وە توڕەیی و خەشمی خوای گەورە بەسەر ڕەزامەندی‌یەکەی هەڵبژێریو ئاخیرەت و ڕۆژی دوایی بە کەمێکی دونیا بفرۆشێ... وەدروستکار بە دروست کراو بگۆڕێتەوە.

**نموونەی دووەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾[1].

واتە: ((نمونەی داستانی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بە سەردا لە پاشان هەڵیان نەگرت-ڕەفتاریان پێ نەکرد- وەکو نموونەی گوێدرێژێکە کە کتێبێکی زۆری هەڵگرتبێ... نموونەیەکی خراپی قەومێکە کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ زانی، وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەم کار ناکات)).

لەم ئامۆژگاری‌یەدا دەبینین خوای گەورە نموونەی ئەو کەسانەی کتێبی خۆی بەسەردا ناردن بۆ ئەوەی ئیمانی پێ بهێنن و لێی ووردببنەوە و کاری پێ بکەن و بانگەوازی بۆ لا بکەن بەڵام بە پێچەوانەی ئەمە جوڵانەوەو هەڵیان

(1) سورة الجمعة: (5).

نەگرت تەنها بە خوێندنەوە و لەبەرکردنێکی ڕووت و دوور لە سەرنج و تێگەیشتن و شوێن کەوتن و جێ بەجێ کردن و تەحکیم کردن، ئا نمونەی ئەوانە وەکو نموونەی گوێدرێژێکە کە کۆمەڵە کتێبێکی زۆری لەسەر پشت بار کرابێ و نەزانێ ئامانج و مەبەست لە هەڵگرتنی ئەم کۆمەڵە کتێبە چیە..

کەواتە: پشك و بەشی ئەو جۆرە کەسانە لە هەڵگرتنی کتێبی خوا وەکو پشك و بەشی ئەو گوێدرێژە وایە کە بێگومان لە هەڵگرتنی کتێبەکان بەس ماندووبوونی پێ دەبڕێت[1].

هەرچەندە ئەم نموونەیە بۆ جولەکەکان هێنراوەتەوە و باسی ئەوان دەکات بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە بە ناو هەڵگری قورئانن و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا کاری پێ ناکەن و ئامادە نین هەق و مافەکانی بپارێزن.

خوێنەرانی سەنگین: لەم دوو نموونەیەی ڕابردوو چەندان ئامۆژگاری بە نرخ و گران بەهای تێدا بوو بۆ ئەو کەسانەی سوود لە زانینەکەیان وەرناگرن و پەیڕەوی بەرنامەی خوا ناکەن.. وە بۆ ئەوەی تازووە فرمێسکی پەشیمانی بڕێژن و نێوانیان لەگەڵ خوای خۆیان چاك بکەن. وە ئێمەش با چاك سەرنجێکی ووردی خۆمان بدەین و بزانین هەق و مافی قورئانی بەرزو مەزنمان داوە و بەر هەڕەشەی ئەم دوو نمونەیە ناکەوین؟

<u>**جۆری دووەم:**</u> نموونەی شاردراوەن و ئاشکرا نین، بەڵکو پێویست بەوە دەکات لێیان وورد بینەوە ئینجا کە سەرنج دەدەین دەبینین لەگەڵ مانای پەندێکی پێشینان -کە پیاو چاکانی پێشوو زۆربەی ئەو پەندانەیان هەر لە قورئان و سوننەت هەڵیان هێنجاوە- یەك دەگرێتەوە، وەکو ئەم چەند نموونەیە کە مشتێکە لە خەروارێك:

---

(1) بۆ شاردزابوون و نموونەی زیاتر بڕوانە کتێبی (الأمثال في القرآن)ی (ابن القیم الجوزیة).

نمونەی یەکەم:

ئیبراهیمی کوڕی موضارب دەڵێ: لە باوکم بیست دەیگوت: لە حوسینی کوڕی فەضلم پرسی و گوتم: بێ گومان تۆ نموونەکانی عەرەب و عەجەم لە قورئان دەردەهێنی، ئایا ئەم پەندە لە کتێبی خوای گەورە دەدۆزیتەوە کە دەڵی: (خير الأمور أوسطها).

حوسەینی کوڕی فضل گوتی: بەڵێ لە چوار جێگادا:

1- لە سوڕەتی (البقرة)دا کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾﴾.

2- لە سوڕەتی (الإسراء)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾﴾.

3- لە سوڕەتی (الإسراء)دا کە دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱدْعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُواْ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُواْ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾.

4- لە سوڕەتی (الفرقان)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾.

نمونەی دووەم[1]:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾[2].

پەندە کوردیەکە دەڵێ: ( چاڵ بۆ خەڵکی هەڵکەنی خۆت تێی دەکەوی ).

نمونەی سێیەم[3]:

(قال سفيان بن عيينة: لا تأتون بمثل مشهور للعرب إلا جئتكم به من القرآن، فقال قائل: فأين في القرآن "اعط أخاك تمرة، فإن لم يقبل فأعطه جمرة!". فقال في قوله تعالى: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ۝٣٦﴾[4].

واتە: (سوفیانی کوڕی عویەینە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: هەر نموونە و پەندێکی دیارم لە پەندە بەناوبانگەکانی عەرەب بۆ بهێنن ئەوا ئامادەم لە قورئانی مەزن بۆتان بهێنمەوە، ئیدی یەکێك لەوان گوتی: کوا لە قورئان کە دەڵێ: خورما بدە براکەت ئەگەر وەری نەگرت و پێی ڕازی نەبوو پشکۆی ئاگری پێبدە. سوفیان گوتی: لەم فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ۝٣٦﴾.

واتە:(هەر کەس پشت لە یادی خوا بکات، شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لە گەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە).

---

(1) پوختەی ئاینی ئیسلام، عەفیف طەبارە.

(2) سورة فاطر: (43).

(3) الفوائد لابن القيم الجوزية (ص74).

(4) سورة الزخرف: (36).

## پێنجەم: قورئانی مەزن و زانستی نوێ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾[1].

واتە: (لە مەودوا بەڵگە و ئایەتەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیا، وە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستە، ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا).

قورئانی مەزن ئاسۆیەکی گەشە.. ڕاستییەکی نەگۆڕاوە.. ڕێگایەکی ڕاستو ڕوونە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لەسەری بڕۆن، وە هەر کەسێك دەیەوێ بگاتە هەقیقەتەکانی قورئان با سەیری ئایەتەکانی بکاو بیانخوێنێتەوە و لێیان ووردبێتەوە، بە سەرنج دانێك بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەمە فەرموودەی خوای بالا دەستە و جنۆکە و مرۆڤ و هاوکارانیان لە هێنانی لەم شێوەیە دەستەوەسانن.وە خوای گەورە ئەم قورئانەی وا گێڕاوە بۆ هەموو سەردەم و ڕۆژگارێك ببێتە سەرمەشق و پێشەنگ و پڕی بێت لە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا و ڕێنیشاندەر بێت بۆ ئەوانەی دەیانەوێ شوێنی قورئان بکەون و بڕوای پێ بهێنن و بیکەنە بەهاری دڵیان.

جا وەنەوەبێ ئەم قورئانە تەنها هەر لە بوارێکدا پێشەنگو سەرمەشق بێتو نهێنیو ڕاستییەکانی بوونەوەری دەرخستبێ، بەڵکو لە هەموو بوارەکان وەکو: زانستی کۆرپەلە، گەردوونناسی، زانستی ئۆقیانوسەکان، زەوی ناسی، ژیانزانی...هتد. پڕیەتی لە بەڵگە و نیشانەی هەمەجۆر، وە لە کێبڕکێدا لەگەڵ زانستی نوێدا هەر ئەو براوەو بە پلەی یەکەم دەرچووەو هەق هەر بەلای ئەو قورئانە مەزنەدا کەوتووە.جا چەند نمونەیەك لەم ئایەتو

---

(1) سورة فصلت: (53).

بەڵگانە دەهێنینەوە لەسەرئەوەی ئەم قورئانە فەرموودەی خوایەو دانان و گوتنی لە دەرەوەی سنوری دەسەڵاتی دروستکراوەکانی خوایە:

**نمونەی یەکەم**[1]:

**قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە:**

دروست کردن سیفەتێکی تایبەتە بە خوای گەورە کەس ناتوانێت خۆی لەو پەرێزە بدات، چونکە ئەو کەسە خۆی دروست کراوە چۆن دەتوانێت دروست کار بێت، پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه و سلم- دەفەرموێت: ((قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي. فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً، أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ شَعِيرَةً ))[2].

واتە:(خوای گەورە دەفەرموێ: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی دێت و لە شێوەی دروست کراوەکانی من دروست دەکات، با مێروولە یان گەردیلەیەك دروست بکەن، یان دەنکە تۆوێك دروست بکەن، یاخود دەنکە جۆیەك).

خوای بەرزو باڵادەست لە باسی سەرەتای دروست کردنی مرۆڤ و قۆناغەکانی پێك هاتنی کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ﴾[3].

---

(1) بە دەستکاری و زیادکردن لە کتێبی (پوختەی پایەکانی باوەڕ)ی بەڕێز (کەریم کوردی) وەرگیراوە.

(2) رواه البخاري (7559).

(3) سورة المؤمنون: (12-15).

واتە: (مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ دروست کردووە، پاشان کردوومانە بە تنۆکە ئاوێك لە شوێنێکی جێگیردا -کە پزدانە- ئینجا لە تنۆکە ئاوەکە خوێن پارەیەکمان دروست کردووە و لە خوێن پارەکە گۆشت پارەیەکمان دروست کردووە، - لە شێوەی پارووییەکی جوراو- لە گۆشت پارەکەش ئێسقانمان دروست کردووە -واتە پەیکەری ئێسك- ئێسقانەکەشمان بە گۆشت داپۆشیوە، ئینجا دروست کراوێکی ترمان لێ پێك هێناوە، پاك و پیت و فەڕی و پیرۆزی بۆ خوا کە چاکترینی دروست کارانە).

گەر سەرنج بدەین دەبینین هەریەکە لەو بڕگانەی لەم چەند ئایەتە مەزنەدا هاتوون ڕاستیەکی زانستی دەردەبڕن و گەورەترین ئیعجازی زانستی دەسەلمێنن، وەك لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین:

1-خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾
واتە: ((مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ دروست کردوە)).

ئەگەر مرۆڤ بگێڕینەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتایی‌یەکان دەبینین لە پێکهاتەی لەشی بیست و دوو (22) ڕەگەز[1] (عنصر) بەشداری دەکەن و بەم شێوەیە دابەش دەبن:-

أ- ئۆکسجین (Oxygen) + هایدرۆجین (Hydrogen) بە شێوەی ئاو بە ڕێژەی (60-65٪) لە کێشی لەش.

ب- کاربۆن (Carbon) + هایدرۆجین + ئۆکسجین بنچینەی پێکهاتە ئەندامی‌یەکان پێك دێنن لە شەکرەمەنی و پرۆتین (Protein)و ڤیتامینەکان (Vitamins)و هۆرمۆنەکان (Hormones).

---

(1) ئەوەی تا ئێستا زانستی سەردەم دۆزیویەتی‌یەوە.

ج- ماددە ووشکەکان: کە بەم شێوەیە دابەش دەبن:

* حەوتیان بریتنین لە: کلۆر (Chlorine- Cl)، گۆگرد (Sulfur- S)، فۆسفۆر (Phosphorus- P) مەگنسیۆم (Magnesium - Mg). کالسیۆم (Calcium-Ca)، پۆتاسیۆم (Potassium - K)، سۆدیۆم (Sodium - Na) کە ڕێژەی (60-80٪) ماددە ووشکەکان پێك دێنن).

* حەوتی تریان بریتنین لە: ئاسن (Iron -Fe)، مس (Copper- Cu)، مەنگەنیز (Manganese -Mn)، (کۆباڵت Cobalt-Co)، تۆتیا (Zn -Zinc)، (مۆلیبیدنیۆم Molybdenum- Mo)، یۆد (Iodine-I).

* شەشیان بە ڕێژەیەکی زۆر کەم بریتین لە : فلۆر (Flourine- F)، ئەلەمنیۆم (Aliminium- Al)، بۆرۆن (Boron- B)، سیلینیۆم (Se -Selenium)، کادمیۆم (Cadimium- Cd)، کرۆم (Cr- chromium).

هەر یەکە لەم ڕەگەزانە لە خاکی زەوی دا هەن و مەرج نی‌یە هەموو پێکهاتەکانی خاك لە پێکهاتەکانی لەشی مرۆڤدا هەبن چونکە پتر لە سەد (100) ڕەگەز لە زەویدا هەن بەڵام هەموو ئەو ڕەگەزانە لە پێکهاتەی مرۆڤ بەشدار نین. ئەوەی تا ئێستا زانراو بێ تەنها ئەم (22) ڕەگەزە بەشدارن لە پێکهاتەی لەشی مرۆڤ. بۆیە خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾. واتە: (لە پوختیەکی وەرگیراو لە قوڕ).

2- وە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً ... ﴾

واتە: (ئینجا کردوومانە بە تنۆکە ئاوێك...).

(نُطْفَةً) لە زمانی عەرەبیدا ناوە بۆ تۆوی پیاو، هەرچەندە لێرەدا مەبەست بە تۆوێکی پیتێنراوە (Fertilized ovum) لە (تۆو + هێلکۆکەی ئافرەت).

بەڵام خوای گەورە قۆناغەکەی بە (نُطْفَةً) ناو بردووە، چونکە کۆرپەلە بە نێرو مێیەوە تۆوی پیاوەکە لە دیاری کردنی ڕەگەز [1] (جنس)ەکەی بەرپرسیارە، لەبەرئەوەی تۆوی پیاو چەشن و خوم و بۆیە (صبغیات)ی ڕەگەزی جیاواز هەڵدەگرێت. بە پێچەوانەی هێلکۆکەی ئافرەتەکە کە تەنها چەشنی ڕەگەزی هاوشێوە هەڵدەگرێت. بەواتایەکی تر: پیاوەکە (نُطْفَةً)ی چەشنی (Xy) هەیە، بەڵام ئافرەتەکە هێلکۆکەی (XX)ی هەیە بەم شێوەیە کۆرپەلەیان لێ پێك دێت:-

أ- تۆوی (y) + هێلکۆکەی (X) = (Xy) بە ویستی خوا نێرینە دەبێ.

ب- تۆوی (X) + هێلکۆکەی (X) = (XX) بە ویستی خوا مێینە دەبێ.

جا ئەگەر پیاوێك لۆمەی خێزانەکەی دەکات لەبەرئەوەی تەنها کچی دەبێ ئەوا با داوا لە خوای گەورە بکات ئەم کارەی بۆ بسازێنێ بۆ پێدانی کوڕ، چونکە وەکو باسمان کرد خۆی لەم مەسەلەیە نزیکە نەك خێزانەکەی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ [2].

واتە: (( هەر بۆ خوایە پاشایەتی و موڵکی ئاسمانەکان و زەوی، هەرچی بیەوێ بەدی دەهێنێ، بۆ هەر کەسێ بیەوێ کچی پێ دەبەخشێت، وە بۆ هەر کەس بیەوێ کوڕی پێ دەبەخشێت. یان کوڕ و کچی بەیەکەوە پێ دەبەخشێت، وەهەر کەسی بوێ نەزۆکی دەکات، بەڕاستی خوا زاناو دەسەڵاتدارە)).

---

(1) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ ﴾ القیامة.

(2) سورة الشوری: (49-50).

3- وە دەفەرموێ: ﴿... فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾﴾.

واتە: (لە شوێنێكی جێگیردا).

مەبەست لە تۆوە تێكەڵ و پێتینراوەكەیە كە لە پزدان (رحم)دا جێگیر دەبێت و بەهۆی دەستەبەربوونی سێ هۆكارەوە پارێزراوە:

هۆكاری یەكەم: لە ڕووی توێژینەوە:

أ- پزدان دەكەوێتە حەوزێكەوە.

ب- ئەو حەوزە لە دیوارێكی ئێسقانی پێك هاتووە.

ج- پزدان چەندەها پشتێنەی پێوەیە كە لە بەشی جیا جیاوە شۆڕ دەبنەوەو دەیبەستنەوە بە دیواری سكەوە یان ئێسقانەكانی حەوزەوە.

هۆكاری دووەم: لە ڕووی هۆرمۆنەوە:

پزدان بەردەوام دێتەوە یەك و گرژ دەبێت و دەجوڵێت. ئەگەر لە كاتێكدا كۆرپەلەی تێدایە هەر بەو شێوەیە لە گرژبوونەوە و خاوبوونەوە دابێت ئەوا دەیخاتە مەترسییەوە بە مراندنی یاخود لەباربردنی، چونكە كاتێك تۆوەكە دەچێتە پزدانەوە ڕێژەی ڕژانی هۆرمۆنی پرۆجسترۆن (progesterone) بەرزدەبێتەوە و بەم هۆرمۆنە پزدان لە گرژبوون و خاوبوونەوە دەكەوێت و جوڵەی كەم دەبێت.

هۆكاری سێیەم: لە ڕووی میكانیكییەوە:

دوای مانگی سێیەم پزدان بە شێوەیەكی بەرچاو دەست دەكات بە بەرزبوونەوە بەرەو سك و لەژێر پارێزگاری ئێسقانەكانی حەوز دەردەچێت. بەڵام لە بری ئەوە خوای گەورە شلەی ئەمینۆسی (Amniotic fluid)ی تێدا زیاد دەكات و لە هەموو لایەكەوە دەورەی كۆرپەلە دەدات و لە پێكدادانی دەرەكی دەیپارێزێت.

4- وەدەفەرموێ: ﴿... ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ...﴾.

واتە (ئینجا لە تنۆکە ئاوەکە خوێن پارەیەکمان دروست کردووە).

(علق): لە زمانی عەرەبیدا بە (زەروو ، زێروو) دەگوترێت ، لە هەمان کاتیشدا واتای هەڵواسین دەگەیەنێت، ئینجا کۆرپەلەش لەم قۆناغەیدا هەم لە شێوەی زێروو دەچێت وە هەم خۆی بە دیواری پزدان هەڵدەواسێت. ئاشکرایە کە زێروو زۆرجار خۆی بە قورگ و گەرووی ئەو کەس و ئاژەڵانە هەڵدەواسێ کە لە ئاوێك دەخۆنەوە زێرووی تێدا بێت، وە ئەگەر چارەسەری خێرای بۆ نەکرێ دەکەوێتە مەترسییەوە.

5- وەدەفەرموێ: ﴿... فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ...﴾.

واتە: (وە لە خوێن پارەکە گۆشت پارەیەکمان دروست کردووە).

(مُضْغَةً ): بە پارچە گۆشتێك دەگوترێت پاروویەك بێت، چونکە کۆرپەلە لەم قۆناغەیدا گۆشت پارەیە و لە هەمان کاتدا لە پارووی جوراو دەچێت و گرنج گرنجە، ئەم قۆناغە دووباری هەیە:

باری یەکەم: پێی دەوترێت (مضغة غیر مخلقة) کە هێشتا گۆشت پارەکە هیچ شێوەیەکی لێ دروست نەکراوە.

باری دووەم: پێی دەوترێت (مضغة مخلقة) کە لەم حاڵەتەدا گۆشت پارەکە سەرجەم ئەندامەکان و شێوەی تەواوی مرۆڤی لێ دروست دەکرێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿... مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ...﴾[1].

واتە: ((ئینجا دەبێتە گۆشپارەیەکی تەواو و سەر و سیمادار یان ناتەواو)).

(1) سورة الحج (5).

6- وەدەفەرموێ: ﴿...فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا...﴾.

واتە: (لە گۆشت پارەکەش ئێسقانمان دروست کردووە -واتە پەیکەری ئێسک- ئێسقانەکەشمان بە گۆشت داپۆشیوە). لەم قۆناغەدا پەیکەری ئێسکی کۆرپەلە بە تەواوی لە گۆشت پارەکە دروست دەبێت و ماسولکە و گۆشت دەورەی دەدەن و پێوەی دەلکێن.

7- وەدەفەرموێ: ﴿... ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ...﴾.

واتە: (ئینجا دروست کراوێکی ترمان لێ پێک هێناوە).

هەتا بەر لە ئێستا کۆرپەلە لە قۆناغی دروست بووندا بووە و هیچ جووڵە و گەشەیەکی بەرچاوی نەبووە، بەڵام لە سەرەتای ئەم قۆناغەوە کە لە کۆتایی مانگی سێیەم و سەرەتای مانگی چوارەمەوەیە کۆئەندامەکانی لاشەی بە تەواوی دروست دەبن و دەست دەکەن بە فرمانی خۆیان و بە شێوەیەکی خێرا کێشی کۆرپەلە زیاد دەکات و لە سەرەتای مانگی چوارەمەوە کۆئەندامی مێشک دەبەسترێتەوە بە سەرجەم کۆئەندامەکانی ترەوە و تێکڕایان جوڵەو کاری خۆیان دەست پێ دەکەن و بە شێوەیەکی بەرچاو گەشە دەکەن[1]. بەڵام دەبێ ئەوە بزانن ڕۆح لە دوای چل (40) ڕۆژ دێتە بەر کۆرپەلە.

(کیث. ل. مور) کە پرۆفیسۆری زانستی توێژینەوە و کۆرپەلە ناسییە لەزانکۆی (تۆرنتۆ)ی کەنەداو خاوەنی کتێبی قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤە (The developing human) کاتێک لە کۆنگرەی نوژداری هەشتەمی سعودی دا بەشداری کرد و ئەو بەڵگانەی بۆ خوێنرایەوە کە لە قورئانی مەزن و سوننەتەدا هاتوون بە تایبەتی ئەم چەند ئایەتەی لێرەدا باسمان کرد

---

(1) کیان (ڕوح) بە بەرهێنانی کۆرپەلە لە چل ودوو (42) شەوی تەمەنیدا دەبێ. نەک وەکو هێندێک کەس وادەزانن لە چوار (4) مانگی کۆرپەلە گیانی دێتەبەر.

گوتی: (بۆم دەرکەوتووە کە ئەم بەڵگانە حەتمەن لە لایەن خواوە بۆ محمد صلی الله علیه وسلم هاتوون، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە محمد صلی الله علیه وسلم نێرراوی خوایە).

لەکۆتایی ئایەتەکاندا خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾[1] واتە: (( جا پاك و پیت و فەڕی و پیرۆزی بۆ خوا کە چاکترینی دروست کارانە)).

**نمونەی دووەم:**

**حەیز و بێنوێژی (الحیض):**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢ ﴾[2].

واتە: (ئەی پێغەمبەر -صلی الله علیه و سلم- پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عادەی مانگانەی ئافرەت، پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەوابوو لەو حاڵەتەدا خۆتان بەدوور بگرن لە هاوسەرەکانتان و نزیکیان مەکەون تا پاك دەبنەوە، جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە -خۆیان شوشت[3]- بچنە لایان، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە، بە ڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆش دەوێت).

---

(1) سورة المؤمنون: (15).

(2) سورة البقرة: (222).

(3) ئەمە ڕای جەماوەری زانایانە کە دەبێ دوای پاك بوونەوە لە خوێنی حەیز ئافرەت خۆی بشوا ئینجا هاوسەرەکەی سەرجێیی لەگەڵ بکا، بڕوانە: صحيح فقه السنة لأبي مالك كمال بن السيد سالم (1،212).

ئەگەر هاتوو لە منداڵدان پیتێن (Fertilization) ڕووی نەدا ئەوا لە دوای چەند ڕۆژێك ئافرەتەکە دووچاری عادەی مانگانە (بێ نوێژی) دەبێت کە ئەمەش بە هۆی سووربوونەوە و داماڵین و خوێن بەربوونی دیوی ناوەوەی دیواری منداڵدان دەبێ، وە هەر لەم ماوەیەدا چەندان گۆڕانکاری تر بە سەر ئافرەتی حەیزدار دێت، ئینجا لەم ماوەیەدا بەرگری (مناعە)ی لەشی ئافرەتەکە کەم دەبێتەوە و لە هەر کاتێکی تر ئاسانتر تووشی نەخۆشی دەبێت بە تایبەتی کە خوێنی حەیز شوێنێکی زۆر لەبارە بۆ گەشەکردنی میکرۆب، جا ئەگەر پیاوەکە لەم ماوەیەدا لەگەڵ خێزانەکەی جووت بوو ئەوا ئەویش تووشی نەخۆشی دەبێ، بەتایبەتی سوتانەوەی میزەڕۆ (التهاب مجرى البول) لەوانەشە ئافرەتەکە زیانی تری پێ بگات وەك سوتانەوەی ملی منداڵدان (التهاب عنق الرحم) لەبەرئەوە باشترین چارەسەر دوورکەوتنەوەی پیاوە لەسەر جێیکردن لەگەڵ خێزانەکەی لە کاتی حەیزدا، وە ئەم دوورکەوتنەوەیە تەنها لە جووتبوونە، وەکو پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه و سلم- دەفەرموێ: ((إصنعوا كل شيء إلا النكاح)) [1] واتە: (هەموو شتێکی لە گەڵدا بکەن جگە لە سەر جێیی) هەموو ئەو ڕاستیانەی سەرەوە ئافرەتێکی پزیشك لە فەرەنسا دوای توێژنەوەیەکی زانستی لە بارەی گرنگترین ئەو مەترسیانەی کە پیاو و ئافرەت لە ئەنجامی کۆبوونەوەیان لەو ماوەیەدا تووشی دەبن باسی کردووە، ئەو ئافرەتەش کە لە نەخۆشی ئافرەتاندا پسپۆڕە دوای ئەوەی کەزانی ئەم ڕاستییە لە قورئانی مەزندا ڕوون کراوەتەوە، بووە مسوڵمان و گوتی: (بۆم ڕوون بووەوە کە قورئان فەرموودەی خودایە، چونکە هیچ کەسێك پێش هەزار و چوار سەد (1400) ساڵ لە توانایدا نەبووە، ئەو مەترسیانە دیاری بکات کە تووشی پیاو و



(1) رواه مسلم (455).

ئافرەت دەبن لە ئەنجامی کۆبونەوەیان لە کاتی حەیز ئەگەر زانیاری توێکار زانی (علم التشریح) و پزیشکی نەخوێند بێت).

نموونەی سێیەم:

پێستی مرۆڤ :

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾[1].

واتە: " بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوابوون بە ئایەتەکانی ئێمە لەمەولا دەیانخەینە ناو ئاگرێك هەر کاتێك کە پێستیان برژا بۆیان بە پیستێکی تر دەگۆڕین بۆ ئەوەی سزاکە بچێژن، بەڕاستی خوا هەمیشە زاڵی کاردروستە".

لەم ئایەتەدا خوای مەزن باس لە بارودۆخی کافران دەکا لە ناو دۆزەخ کە هەر کاتێك پێستیان سووتا ئەوا بە پێستێکی تر بۆیان دەگۆڕیت تاوەکو بەردەوام سزا بچێژن ئینجا با بزانین بۆ هەر تەنها پێست؟وە حیکمەت لە گۆڕینی پێست چیە تاوەکو دۆزەخیەکان سزای پێ بچێژن؟

بێگومان یەکێك لە هەرە کارە گرنگ و فەرمانەکانی پێست بریتیە: لە هەست کردن، هەست کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە لە بەرکەوتن و ساردیو گەرمی و ئازار. کە ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەسەر ڕووی پێست چەندان خاڵی هەست کردن هەن کە لەگەڵ کۆتایی سەرە ڕیشاڵە دەمارەکان (الالیاف العصبیة) ڕێکن کە هەستەکان لەم خاڵانەوە بۆ ڕیشاڵە دەمارەکان و لەوانیشەوە پێبەپێ بۆ ناوەندە کۆئەندامی دەمار (Central Nervous) دەگوازرێنەوە و لەوێ ساردی و گەرمی و ئازار و بەرکەوتن (اللمس) لێك

---

[1] سورة النساء (56).

جیادەكرێنەوەو لێكدانەوەو تەفسیری خێرای بۆ دەكرێ. هەموو ئەمانە كەمتر لە چاوتروكانێك ئەنجام دەدرێن، بەجۆرێك تیژڕەوی و گواستنەوەی ئەم كردارە كارەبایی‌یانە بەناو دەمارەكان لە چركەیەكدا هەشتا مەترە (80م\چركە).

ئینجا لە لاشەی مرۆڤ ئەوەی لە هەموویان زیاتر هەستی گەرمی تێدابێ پێستە. جا ئایا پێغەمبەرمان محمد صلى الله عليه وسلم ئامێری توێكارزانی (التشريح)ی هەبووە تاوەكو ئەوە بزانێ؟ یان ئەم ئایەتە یەكێكە لە ئایەتەكانی خوا كەوا شاهێدی دەدا كە قورئان فەرموودەی خوایە و بە زانستی خۆی دایبەزاندووە[1].

هەر بۆ نموونە ئەو كەسانەی لە بەشی سووتان لە نەخۆشخانەكان كاریان كردووە دەزانن ئەگەر كەسێكی سووتاو شوێنی سووتانەكەی زۆر بوو بە جۆرێك پێستەكەی هەموو خواردبوو، واتە سووتانەكەی پلە (3) سێ بوو ئەوا شوێنە سووتاوەكە ئازارێكی ئەوتۆی نییە وەكو ئەو كەسەی سووتانەكەی پلە دووە (2) و تەنها پێستی سووتاوە.

بۆیە هەر كاتێك دۆزەخی‌یەكان -خوابمان پارێزێ- پێستیان سووتا و ئەما خوای گەورە بە پێستێكی تر بۆیان دەگۆڕێ و نوێی دەكاتەوە تاوەكو بەردەوام لە ئەشكەنجە دابن.

﴿...إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾﴾[2].

(1) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾﴾ النساء.

(2) سورة الحديد: (22).

**نموونەی چوارەم:**

**دوو لەتبوونی مانگ:**

خوای بە توانا و دەسەڵات دەفەرموێ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ۝٣﴾ [1].

واتە: "ڕۆژی دوایی نزیك بووەوە، مانگ لەت بوو، وە ئەگەر بێ بڕوایان موعجیزەو بەڵگەونیشانەیەك ببینن پشت هەڵدەکەن، وە دەڵێن ئەمە جادوویەکی بەردەوامە، وە بە درۆیان زانی و شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتن، لە کاتێکدا هەموو کارێك سەرەنجامێکی هەیە".

ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: (سأل أهل مكة أن يريهم آية، فأراهم إنشقاق القمر) [2].

واتە:(بێباوەڕانی مەککە داوای بەڵگە و موعجیزەیەکیان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد – بیسەلمێنێ کە پێغەمبەرە– پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دوو لەتبوونی مانگی نیشان دان).

لە ڕیوایەتی تورمزی: ئیتر ئەم ئایەتانە دابەزین: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢﴾ [3].

---

(1) سورة القمر: (1-3).

(2) رواه البخاري (4867).

(3) سورة القمر: (1- 2).

**بەسەرهاتێکی واقیعی:**

لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا کە لەگەڵ زانای مسوڵمان دکتۆر زەغلول نەججار کراوە، پێشکەشکاری بەرنامەکە دەربارەی ئەم ئایەتە :﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ ﴾ پرسیاری لێ کرد، ئایا ئەم ئایەتە ئیعجازێکی قورئانی زانستییە؟

دکتۆر زەغلول لە وەڵامدا گوتی: ئەم ئایەتە بەسەرهاتێکی بۆ من لەگەڵە، ماوەیەك بەر لە ئێستا من لە زانکۆی کاردیف (Cardif) لە ڕۆژئاوای بەریتانیا موحازەرەیەکم گوتەوە، لە موحازەرەکە کەسانی مسوڵمان و نامسوڵمانی تێدابوو، لەو کۆڕەدا گفتوگۆیەکی زیندوو دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئانی بەڕێز لە ئارادابوو... [1].

دکتۆر زەغلول دەڵێ: دوای ئەوەی قسەکانم تەواوکرد گەنجێکی مسوڵمانی بەریتانی خۆی ناساند و گوتی، من (داوود موسا بیتکوك)م سەرۆکی حیزبی ئیسلامی بەریتانی، ئینجا گوتی: ئەی گەورەم ئایا ڕێگەم دەدەی بە ئیزافەیەك؟

منیش پێم گوت: فەرموو.

گوتی: من – پێش ئەوەی مسوڵمان بم – لە ئایینەکان دەگەڕام، یەکێك لە قوتابییە مسوڵمانەکان وەرگێڕاوێکی قورئانی بەڕێزی کردە دیاری بۆم... سوپاسم کرد و بردمەوەماڵەوە... لەو کاتەی کردمەوە یەکەم سورەتێك کە ڕوانیم سورەتی (القمر) بوو ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ ﴾ م خوێندەوە، گوتم: ئایا ئەم قسەیە دەچێتە عەقڵەوە؟ ئایا دەکرێ مانگ لەت بێ ئینجا یەك بگرێتەوە، چ هێزێك هەیە ئەمە بکا؟

---

(1) بۆ درێژەی بابەتەکە بڕوانە (موسوعة الاعجاز العلمي في القران الكريم والسنة المطهرة)ی يوسف الحاج احمد (ل322) بکە.

داوود دەڵێ: ئەم ئایەتە بووە کۆسپ لە بەردەوام بوونم لە خوێندنەوە، ئیدی سەرقاڵی کاروباری ژیان بووم، بەڵام خوای گەورە دەیزانی چەندە دڵسۆزم لە گەڕان بەدوای ڕاستی دا.

ئەوەبوو پەروەردگارم لە پێش تەلەفزیۆنی بەریتانی دایانم کە لەو کاتە لە مابەینی پێشکەشکاری بەرنامەکە و سێ زانای بۆشایی ئەمریکی گفتوگۆیەك هەبوو، پێشکەشکاری بەرنامەکە ڕەخنەی لەزانایەکان دەگرت بەوەی ئەو هەموو سەروەت و سامانە زۆرە خەرج دەکەن لەپێناو گەشتەکانی بۆشایی ئاسمان لە کاتێکدا خەڵکی زەوی بەدەست هەژاری و برسێیەتی و نەخۆشی و دواکەوتوویی دەناڵێنن، وە دەیگوت ئەگەر ئەم پارەیە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی خەرج بکرێ باشترە.

ئەو سێ (3) زانایەش داکۆکیان لە بۆچوونەکانیان دەکرد و دەیانگوت: ئەم جۆرە خەرج کردنە وەنەبێ هەر لەم بوارە دابێ، بەڵکو لە بوارەکانی تری ژیانیش وەکو پزیشکی و پیشەسازی و کشتوکاڵی جێبەجێ دەکرێ. وە لە میانەی گفتوگۆیەکەیاندا قسە لەسەر دابەزینی مرۆڤ بۆ سەر مانگ کرا کە ئەمەیان زۆرترین بڕی پارەی دەوێ و دەیانگوت: زیاتر لە سەد (100) هەزار ملیۆن دۆلاری تێ دەچێ. پێشکەشکارە بەریتانیەکە هاواری کرد و گوتی: ئەمە چ گێلێیەکە؟ سەد هەزار ملیۆن دۆلار تەنها بۆ ئەوەی زانستی ئەمریکی بگەیەننە سەر مانگ؟

ئەوانیش گوتیان: نەخێر، ئامانج لەمە دانانی زانستی ئەمریکا نەبووە لەسەر ڕووی مانگ بەڵکو ئێمە پێکهاتەی ناوەوەی مانگمان دیراسە دەکرد. ڕاستیەکەمان بینی کە ئەگەر چەندەهای ئەو پارەیە سەرف بکەین بۆ بڕوا پێکردنی خەڵکی ئەوا کەس بە ڕاستمان نازانێ.

پێشکەشکارەکە گوتی: ئەو ڕاستیە چیە؟

گوتیان: ئەو مانگە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەت بووە و دوایی نووساوەتە یەك.

پزیشکەشکار: چۆن ئەمەتان زانی؟

گوتیان: گورزەیەك لە بەردی گۆڕاو (الصخور المتحولة)مان بینی کە مانگ لە دەرەوە بۆ ناوەوە، وە لە ناوەوە بۆ دەرەوە کەرت دەکات، کە ڕاوێژمان بە زانایانی زەوی و زانایانی جیۆلۆجی کرد، گوتیان: ئەمە نابێ ڕوویدا مەگەر مانگ دوو لەت بووبێ و دوایی پێکەوە نووسابێتەوە.

داوود دەڵێ: لە کورسەیەکەی لە سەری دانیشبووم بازێکم هەڵدا و زیاتر لە تەلەفزیۆنەکە هاتمەپێش و گوتم: موعجیزەیەك پێش (1400) هەزار و چوارسەد ساڵ بۆ محەممەد صلى الله عليه وسلم ڕوویداوە، خوای گەورەش ئەمریکاییەکان بە سەرف کردنی سەد هەزار ملیۆن دۆلار ژێربار دەکا تاوەکو بۆ مسوڵمانان بیسەلمێنن؟ هەر دەبێ ئەم ئایەتە ڕاست بێ.

داوود دەڵێ: گەڕامەوە لای قورئانەکە و سوڕەتی (القمر)م خوێندەوە.. ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ چوونە ناو ئایینی ئیسلام.

## قورئانی مەزن و زانستی ڕاستەقینە پێچەوانەی یەکتر نین

## شـەشـەم:

## قورئان و فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم:

ئەگەرچی قورئانی بەڕێز چەندان پلە و ئیمتیازی بەسەر سوننەتدا هەن و زۆربەی هەرەزۆری ئایەتەکانی بێ سوننەت و بە سێنانی مەبەستیان دەزانرێ بەڵام هیچیان بەدیلی ئەویتریان نین، چونکە بە بێ تێگەیشتن لە سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و لە دەرگای ئەو بەڕێزەوە نەبێ ناتوانین بە تەواوی بچینە نێو جیهانی قورئانەوە، بە تایبەتی لە حاڵەتی کردەوەیی و لەکاتی گۆڕین و چاککردنی واقیعدا... فەرموودە و ڕەفتارو ڕەوشت و کار و بڕیارەکان و ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- تەرجەمەو لێکدانەوەی کردەییو زیندووی قورئانە هەر بۆیەش خوای پەروەردگار پێی فەرمووە: ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾[1].

واتە: (وەقورئانیشمان بۆ تۆ نارد بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی لەوەی بۆیان نێردراوەتەوە خوارەوە، بەڵکو بیربکەنەوە و تێیی بگەن).

وەئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (جميع ما تقوله الامة شرح للسنة، وجميع السنة شرح للقرآن)[2].

واتە:(هەموو ئەوانەی زانایانی ئوممەت گوتویانە لێکدانەوەیە بۆ سوننەت، وە هەموو سوننەتیش لێکدانەوەیە بۆ قورئان).

بۆیە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم بە بەردەوامی لە کۆنەوە تا ئێستا و لەمەودواش لە لایەن دووڕوو و زەندیقانەوە

---

(1) سورة النحل: (44).

(2) نقل هذا السيوطي في كتابه الحاوي للفتاوى (2/286).

دووچاری تانە و تەشەر و شك و گومان تێ خستن بووە. هەموو ئامانج و نیازیشیان لەم بەد ڕەفتارییە تەنها لەکارخستنی سوننەت بووە لە مەیدانی کردەوە پێکردن و بە بەڵگە نەژماردن. ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری تەفسیرو واتاکانی قورئانی بەڕێز بکەن و بە پێی ئارەزوو و هەوەسی خۆیان لێکی بدەنەوە. بەڵام خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی قورئانی مەزنی داوە، سوننەتیش لێکدانەوە و شەرحی قورئانە، کەواتە ئەمیش بەر ئەم پاراستنە دەکەوێت و ڕزگاری دەبێت لە دەستی پیس و پۆخڵی کوفر دۆستان.. زانایانی ڕەسەن و ئیسلام دۆستیش بۆ بەرگری کردن لە سوننەت درێغیان نەکردوەو چەندان کتێبیان نوسیوە، کە ئەمانە هێندێکیانن:

1- الروض الباسم في الذب عن سنة أبي القاسم صلى الله عليه وسلم لمحمد بن إبراهيم الوزير اليماني 755هـ.

2- مفتاح الجنة في الاحتجاج بالسنة للسيوطي 911هـ.

3- السنة قبل التدوين، د.محمد عجاج الخطيب.

4- دفاعاً عن السنة. د.محمد أبي شهبة

بۆیە ئێمەش لە سێ (3) خاڵدا باس لەوە دەکەین و لە هەریەکەیان چەند بەڵگەیەك لەسەرئەوە دەهێنینەوە کە کارکردن بە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەکو قورئانی مەزن پێویستە و ئەرکی سەرشانمانە. ئەگەرنا جگە لە ماڵ وێرانی دونیا و نەهامەتی قیامەت هیچی تری بە دواوە نابێ:

**خاڵی یەکەم: بەڵگەکان لە قورئانی بەرز:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾[1].

واتە: ( وەفەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی ڕەحم و بەزەییتان پێ بکرێت).

وەدەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾[2].

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە فەرمانبەرداری خوا و فەرمانبەرداری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بکەن، وە ئەوانەی کار بەدەستن لە خودی خۆتان، خۆ ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە لای خواو (قورئان) وەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (سوننەت) ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترە، وەئاکام و ئەنجامی چاکترە).

وە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾[3].

واتە: (وە ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی دان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بهێنن، وە پارێزکاری خوا بکەن ، بەڕاستی خوا بە توندی تۆڵە دەستێنێت).

---

(1) سورة ال عمران: (132).

(2) سورة النساء : (59).

(3) سورة الحشر: (7).

**خاڵی دووەم:**

**بەڵگەکان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خۆی:**

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: « كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، إلاَّ مَنْ أَبَى ». قالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنْ يَأْبَى؟ قَالَ: « مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فقدْ أَبَى »[1].

واتە:(هەموو ئوممەتم دەچنە بەهەشت جگە لەو کەسەی نەیەوێ).

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا: جا کەس هەیە نەیەوێ؟

فەرمووی: (ئەوەی فەرمانبەریم بکات دەچێتە بەهەشت، وەئەوەی سەرپێچیم بکات ئەوە بێگومان نایەوێ).

عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– أَنَّهُ قَالَ: « أَلاَ إِنِّى أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ وَمَا وجدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ »[2].

واتە: لە مقدادەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم کە فەرمویەتی: ((ئاگادار بن! بێگومان من کتێب – قورئان– و هاوشێوەی ئەوم –کە سوننەتە– پێ دراوە ووریا بن! نزیکە پیاوێکی تێر و پڕ کە لە سەر قەنەفە کەشخەکەیەتی بڵێ: تەنها دەست بەو قورئانەوە بگرن، وەهەرچی لە حەڵاڵتان تێدا بینی حەڵاڵی بکەن، وە هەرچی لە حەرامتان تێدا بینی حەرامی بکەن)).

(1) رواه البخاري (6737).

(2) رواه أحمد (4/131)، وأبوداود (4604) واسناده جيد، والترمذي (2664)، والحاكم بأسناد صحيح.

هەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا، كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ))[1].

واتە: (دوو کارو فەرمانم لە نێو ئێوەدا جێ هێشتووە، هەرگیز گومڕاو سەرگەردان نابن ئەگەر دەستی پێوە بگرن: کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم).

**خاڵی سێیەم: قسەی نەستەقی زانایانی ئوممەت و شوێن کەوتوانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم:**

* عبداللەی کوڕی عەباس خوا لێیان ڕازی بێ دەیگوت: (إذا سمعنا أحداً يقول: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إبتدرته أبصارنا).

واتە: (ئەگەر گوێ بیست باین کە یەکێك گوتبای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی لە خۆشیان چاومان مۆڵەق دەبوو).

* لە ئەیوبی سەختیانیەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتویەتی: (إذا حدثت الرجل بسنة فقال دعنا من هذا، وأنبئنا عن القرآن فاعلم أنه ضال).

واتە: (ئەگەر باسی سوننەتت بۆ پیاوێك کرد و ئەویش گوتی واز لەمە بهێنە و باسی قورئانمان بۆ بکە ئەوە بزانە ئەو پیاوە گومڕا بووە).

* شافعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (متى رويت عن رسول الله صلى الله عليه وسلم حديثا صحيحا فلم آخذ به فاشهدكم أن عقلي قد ذهب).

وقال أيضا: (إذا قلت قولا وجاء الحديث عن رسول الله صلى الله عليه وسلم بخلافه فاضربوا بقولي الحائط).

واتە:(هەر کاتێك لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەیەکی صەحیحم بۆ گێڕانەوەو خۆم وەرم نەگرت و بەبەڵگەم نەژمارد ئەوا شاهێد بن ژیریم لە دەست داوە).

---

(1) رواه مالك في الموطأ، وصحح أسناده الألباني في سلسلة الصحيحة (1761).

وەهەروەها دەڵێ: (ئەگەر قسەیەکم گوت بەڵام لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تێك گیرا و پێچەوانە بوو ئەوا قسەکەی من بە دیوار بکێشن).

* مسوڵمانێك بۆی گێرامەوە گوتی: دوای ئەوەی لە نیوەی شەو وەکو جاران چەند ڕکاتێکم شەونوێژ کرد حاڵەتێکی ئیمانی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەرم بەسەر داهات. تەنانەت بە هێنانی ناوی پێغەمبەر محمد -صلى الله عليه وسلم- بەسەر زوبانم تەزوو بە لەش و گیانم دادەهات و هەستم بە شیرینی ئیمان دەکرد.

## حەوتەم: قورئان و ئیمان

ئیمان ڕاستییەکی دامەزراوە، نرخێکی هەرە مەزنە.. تام و چێژێکی لە بن نەهاتووی خۆشە... گەوهەرێکی ساف و پڕشنگدارە.. .نورێکی ڕۆشنی ڕێنموونی کارە... زینەتێکی جوان و ڕازاوەیە.. پلە و پایەیەکی بەرزو مەزنە.. بەخششێکی خوای خۆشەویستە.. دەیبەخشێ بە هەرکەسێك خوا خۆشی بوێ... نیعمەتێکی شیرین و نەبڕاوەیە، نیعمەتێکە هەر کەسێك نەیچەشتبێ هەستی پێ ناکاو نازانێ چۆنە، لەگەڵدا ژیانی ژیانە؛ بە بێ ئیمان ژیان ژانە، ژانی مردن نەوەکو بوون.

بەهۆی ئیمانەوە مرۆڤ سەنگی خۆی دەبینێتەوە و دەزانی نهێنی بوونی لەم بوونە چییە و چ ئەرك و کارێکی پێ سپێردراوە، مرۆڤ بە هۆی ئیمان هەموو شتێکە و بە بێئیمانیش هیچ، ئەگەر ئیمانی دۆزیەوە هەموو شتێك دەدۆزێتەوە.. وە ئەگەر وونیشی کرد هەموو شتێك وون دەکات و هیچ شتێك سوود و قازانجی پێ ناگەیەنێت، بەڕاستی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ڕاستی فەرمووە کە دەڵێ: (لو علم الملوك وأبناء الملوك ما نحن فيه لجالدونا عليه بالسيوف)[1].

واتە: (ئەگەر پادشاو پادشازادەکان بەو حاڵەی ئێمەیان زانیبایە کە تێیدان بۆ ئەستاندنی ئەو حاڵە شەڕە شیریان لە گەڵ دەکردین).

بۆیە خوای گەورە بە هۆی ئەو ئیمانەی پێی بەخشیوین منەتمان بە سەردا دەکاو دەفەرموێ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾[2].

---

(1) الزهد الكبير للبيهقي (92/1).

(2) سورة الحجرات: (17).

واتە: (ئەو کەسانە منەت دەکەن بە سەر تۆدا ئەی محمد صلی الله علیه وسلم چونکە مسوڵمان بوون، تۆش بڵێ: منەتی مسوڵمان بوونی خۆتان بەسەر مندا مەکەن بەڵکو خوا منەت دەکات بە سەر ئێوەدا چونکە ڕێنموونی کردوون بۆ ئیمان و باوەڕ هێنان ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن -کە ئیمان دارن-).

ئەگەر سەرنجی قوڕئانی پایەدار بدەین دەبینین ووشەی ئیمان بە هەموو جۆرەکانیەوە هەشت سەد ودوانزە (812)جار هاتووە، تەنانەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فێرکردنی دۆست و هاوەڵانیدا ئیمانی پێش قوڕئان خستووە، وەکو لەم فەرمایشتەدا:

عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ فَتَعَلَّمْنَا الإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا »[1].

واتە: (لە جوندبی کوڕی عبداللهوە ڕەزای خوای لە سەر بێ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دابووین و گەنج و جەحێڵ بووین، جا ئێمە ئیمان فێربووین پێش ئەوەی قوڕئان فێربین ئینجا کە قوڕئان فێربووین بە هۆیەوە ئیمانەکەمان زیادی دەکرد).



(1) رواه البيهقي في الكبرى (120/3)، والشعب (76/1)، وابن منده في الايمان (370/1)، وصحيح إبن ماجة للألباني (52 ، 170).

## پرسیارێکی گرنگ

**باشە حیکمەت چییە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم ناسین و ڕواندنی ئیمانی پێش فێرکردنی قورئان خستوە؟**

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر سەرنج بدەین و رابمێنین دەبینین ڕواندنی ئیمان و تەزکیەو پاك کردنەوەی دڵ و دەروون یەکێکە لەو چوار ئەرکە هەرە گەورەو گرنگانەی کە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی محمد صلی الله علیه وسلم کردووە هەستێ بە ئەنجامدان و ڕواندنی لە دڵ و دەروونی یارو یاوەرانیو بڵاوکردنەوەی بە ناو ئوممەتەکەی، وەکو لەم سێ ئایەتەدا:-

1- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾[1].

واتە: (هەروەکو -بۆ تەواوکردنی نازو نیعمەتم - لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لە خۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە -دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراتان- خاوێن دەکاتەوەو فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی).

2- وەدەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾[2].

---

(1) سورة البقرة: (151).

(2) سورة آل عمران: (164).

واتە:(سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان ئایەتەکانی ئەویان بە سەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچووبوون).

3- وەدەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِى ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ۝٢ ﴾[1].

واتە:(ئەو خوایەی لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەوار پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراو نادیاریان پوختە دەکات و فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕایی و سەر لێشێواویەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون).

ئەم سێ ئایەتە مەزنە ئاماژە بە بەرنامەیەکی پەروەردەیی سەر ڕاست و سەرکەتوو دەکات، بانگەوازی بانگخواز و مامۆستا و بەرنامەڕێژ و پەروەردەکاران دەکات کە ئاگاداری ئەم ئاماژە قورئانی‌یە بن و لە فێرکردن و پێگەیاندنی دەوروبەریان تێبینی بکەن، چونکە پەروەردە و فێرکردن بە بێ ڕیزکردنی ئەولەوییات (أولويات) دووچاری گەلێك هەڵە و پەڵە و لادانمان دەکات.

بەڵێ هەر کام لە:-

* خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا بە سەریاندا بۆ خۆسازدان و بۆ ڕێ خۆشکردن.
* تەزکیە کردن و پاککردنەوەی نەفس و چاککردن و گەشەپێدان و بەرەو پێش بردنی.

---

(1) سورة الجمعة: (2).

* فێرکردنی بەرنامەی خوا کە قورئانە.

* فێرکردنی لێزانی و کارامەیی بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی خوا کە سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم یەکێکی ترە لە ئەرکە گەورەو بنەڕەتییەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هەموو ئەوانەی شوێن کەوتووی ئەون لە ناو ئوممەتەکەیدا.

چونکە بەهۆی تەزکیەوە مرۆڤ سەرفرازو بەختەوەری ڕاستەقینەی دونیاو قیامەت دەبێ، ئەوەتا خوای گەورە دوای ئەوەی لە سورەتی (الشمس) سوێند بە کۆمەڵێك شتی گرنگ دەخوات دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە:(بە ڕاستی سەرفرازو ڕزگاری بوو ئەو کەسەی دەروونی خۆی پاك و پوخت کردەوە، وەبێ گومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفس و دەروونی خۆی نا پوخت ئاڵوودەی گوناه و تاوان کرد).

وە لە سورەتی (الأعلى) دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾ کە تەزکیەی پێش کارەکانی تر خستووە.

وەهەروەها بە هۆی تەزکیەوە لە شوێن کەوتنی شەیتان و خراپە و تاوان دوور و پارێزراو دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾[1].

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە شوێن هەنگاوو نەخشەو پیلانەکانی شەیتان مەکەون، هەر کەس شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ ئەوا

---

(1) سورة النور: (21).

بەڕاستی شەیتان فەرمان دەکات بە کاری زۆر ناشیرین و (زینا)و خراپە، وەئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبوایە بە سەرتانەوە هەرگیز کەسێ لە ئێوە پوخت و پاك نەدەبووەوە. بەڵام خوا هەر کەسی بوێ (شیاو بێ) پاکی دەکاتەوە. وەخوا بیسەر و زانایە).

کەواتە: ئەگەر هاتوو بە بێ تەزکیە و ئیمان فێری قورئانی مەزن بووین ئەوا هیچ تام و چێژ و خۆشی‌یەك لە فێربوون و خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئانی مەزن یان هەر خوا پەرستی‌یەکی تر ناکەین، بۆیە زۆربەمان لەکاتی خوێندنەوە و موتالا کردنی چەند لاپەڕەیەك لە قورئانی مەزن هەست بە ماندوو بوون و بێزاری دەکەین. فەرموودەکەی ئیمامی عوسمانیش دەقا و دەق دێتە جێ کە دەڵێ: (لو أن قلوبنا طهرت ما شبعنا من كلام ربنا).

(قال عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمر يَقُولُ : لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنْ دَهْرِنَا وَأحدنَا يُؤْتَى الإيمَانَ قَبْلَ الْقُرْآنِ ، وَتَنْزِلُ السُّورَةُ عَلَى مُحَمَّدٍ –صلى الله عليه وسلم– فَيَتَعلَّمُ حَلاَلَهَا، وَحَرامهَا، وَآمرهَا، وَزَاجِرهَا، وَمَا يَنْبَغِي أنْ يَقِفَ عِنْدَهُ مِنْهَا، كَمَا تَعلَّمُونَ أَنْتُمُ الْيَوْمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ رِجَالاً يُؤْتَى أحدُهُمُ الْقُرْآنَ قَبْلَ الإيمَانِ فَيقْرأ مَا بَيْنَ فَاتحته إِلَى خَاتمَته مَا يَدْرِي مَا آمِرُهُ وَلاَ زَاجِرُهُ وَلاَ مَا يَنْبَغِي أنْ يَقِفَ عِنْدَهُ مِنْهُ فَيَنْثُرُهُ نَثْرَ الدَّقَلِ)[1].

واتە: (عبداللەی کوڕی عومەر خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ دەڵێ: (بەڕاستی ئێمە ماوەیەکی زۆر ژیایین، وە هەر یەکەمان ئیمان پێش قورئان فێر بووین، کە سورەتێك بۆ سەر محمد صلی الله علیه وسلم دادەبەزی ئەوا فێری حەڵاڵ و حەرام و فەرمانەکانی و سەرزەنشتەکانی ئەو سورەتە دەبوو، وەئەوەی پێویست دەبوو لە لای بوەستێ دەوەستا، ئینجا بێ گومان

---

(1) حسن غريب، رواه الحاكم في المستدرك (1/91)، وقال: صحيح على شرط الشيخين ولا أعرف له علة. سنن البيهقي (5406)، وابن منده في الإيمان (1/369)، وابن عساكر في التاريخ (31/160)، وصححه الألباني (1/300).

پیاوانێکم دیت قورئانیان پێش ئیمان وەرگرت، لە سەرەتای قورئانەوە تا کۆتاییەکەی دەخوێنێتەوە نازانێ فەرمانی بە چی پێ دەکاو لە چی سەرزەنشتی دەکات، وە لە کوێ پێویستە لەلای بوەستێ، لەدەمی هەڵدەوەرێ هەروەکو هەڵوەرینی خراپترین جۆری خورما).

کەواتە: باخاوەنی ئەو ئیمانە بین کە لە کاتی خوێندنەوەی قورئان و ئەنجام دانی هەر خوا پەرستیەکی تر تام و شیرینی ئیمان بکەین و دڵ و دەروونمان پێی ئاسودە بێت و ببێتە مایەی دوورخستنەوەمان لە هەر کارێکی بەد و خراپ.

## زیاد و بەرزبوونی ئیمان بەهۆی قورئان:

خوای گەورە ئیمانی وا گێڕاوە بکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگەو هۆکارەکانی دەوروبەر چ بە کاری چاك وەیان خراپ، بە هۆی ئەنجامدانی کاری چاك زیاد دەکات و بە هی خراپیش کەم دەکات. بۆیە بەردەوام ئەو ئیمانە داوا لە خاوەنەکەی دەکات لە گەڵی بێ و هەر بۆ ئەو بێ.. وە ژیان و گوزەران لە سایەی ئەودا بباتە سەر، وە داوای لێ دەکات خزمەتی بکاو یارمەتی بدات.. وەداوای لێ دەکات ژینگەو کەش و هەوایەکی لەبارو گونجاو و چەندان هۆکاری چاك و نایابی بۆ دابین و دەستە بەر بکات، هەموو ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو ئیمانە بەهێز بێ و دابمەزرێ و بەرەو بەرزی و زیادی بچێ، هەروەها ئیمان داوای ئەوەش لە خاوەنەکەی دەکات چاودێری و پاسەوانی بکات و لە هەرچی نەخۆشی و کاری زیانبەخش و گوناه و تاوان و کەم و کوڕی و سەرپێچی هەیە دووری بخاتەوە و بیپارێزێ.

جا یەکێك لەو هۆکارانەی ئیمانی پێ زیاد دەبێ بریتییە:لە خوێندنەوەو موتالا کردنی قورئانی مەزن، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ

يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾[1].

واتە: (بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کاتێك کە باسی خوا کرا و ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و دەهەژێت. وە ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنرێتەوە ئیمان و بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن، ئەوانەن کە بە ڕاستی نوێژەکانیان بە جێ دەهێنن، وەهەندێك لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمان داوون دەیبەخشن، هەر ئەوانە بڕوادارانی ڕاستەقینەن.. پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و ژیان و لێ خۆش بوونی تاوانەکانیان و ڕۆزی پەسند و چاکیان بۆ هەیە).

وەهەروەها دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾[2].

واتە:(ئەگەر سوڕەتێك - لە قوڕئان- بنێردرێتە خوارەوە- دووڕووەکان- هی وایان هەیە دەڵێ: کام لە ئێوە بەم سوڕەتە ئیمانی زیادی کرد، جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئیمانیان زیاد دەکات و بەهێزتر دەبێ، وەئەوان مژدە بەخشن و خۆش حاڵن).

هەروەها ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە بابەتی قوڕئان و ئیمان کە جوندب بۆمانی گێڕایەوە بەڵگەیەکی تری زۆر ڕوون و ئاشکرایە لە سەر زیادبوونی ئیمان بە هۆی قوڕئان.

---

(1) سورة الانفال: (2-4).

(2) سورة التوبة: (124).

## هەشتەم: حوکم کردن بە قورئانی بەڕێز لە فەرمانڕەوایەتیدا

تاکە دەستور و دوا بەرنامەی خوا بۆ سەر زەوی بۆ پێغەمبەرەکەی محمد صلی الله علیه وسلم و شوێنکەوتوانی بریتیيە لە شەریعەتی خوا کە خۆی لە قورئان و سوننەتی پیرۆزی پیغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبینێتەوە، بۆیە پەیڕەوی کردن و لێ لانەدان لەم شەریعەتە کارێکی پێویستە و ئەرکی سەرانی هەموو لایەك و یەکە بە یەکەی موسڵمانانە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾[1].

واتە: (لە پاشان تۆمان –ئەی محمد صلی الله علیه وسلم خستۆتە سەر بەرنامەو شەریعەتێکی ڕاست و ڕەوان لەبارەی کاروباری ئایینەوە، دەجا تۆش شوێنی بکەوە، وە شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن).

کەواتە هەر لادان و ترازانێك لە قورئانی مەزن و حوکم پێ نەکردنی لە فەرمانڕەوایەتیدا بریتیيە لە فەرمانبەردارنەبوون بۆ خوا و شوێن کەوتنی ئارەزوو و پاشانیش میللەت بەرەو هەڵدێر بردن.

شاهۆی شاعیریش جوانی گوتوە کە دەڵێ:

موتیعی حوکمی قورئانم

نە بابی و نە زەردەشتی، نە مولحیدم نە ماسۆنی

نە مارکسیم، نە لادینم، موتیعی حوکمی قورئانم

هەروەها کاك فەرهاد برادۆستی دەڵێ:

ئەی ئەوەی کەوا ژیرو وشیارە     حوکم بە قورئان باشترین کارە

هەر کەسێ حوکم بە قورئان نەکا     کافر و فاسقە هەروا زۆردارە

---

(1) سورة الجاثية: (18).

## نۆیەم: دوعاو چارەسەری بە قورئانی مەزن

لەم چەند ساڵەی دواییدا کتێبخانەکانمان لەم بارەیەوە چەندان نامیلکەو کتێبی لەخۆ گرت و چەندەها نووسەر ئەرکیان کێشاو کتێبیان نووسی. بۆیە من زۆر بە پێویستم نەزانی لێرەوە هەمان بابەت بە شێوە داڕشتنێکی تر باسی لێوە بکەم تەنیا ئەوە نەبێت کە بڵێم خوای میهرەبان بە هۆی قورئانەوە شیفا دەنێرێ و کردوویەتی بە چارەسەر بۆ نەخۆشییە جەستەیی و دەروونییەکان وەکو دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾﴾[1]... وە هەروەها ئاماژە بە هێندێك لەو کتێبانە بکەم کە ئەگەر خوێنەر بیانخوێنێتەوە دەتوانێ سوودێکی زۆریان لێ وەربگرێت. لەوانە:-

1- (الاذكار المنتخب من كلام سيد الابرار) ئیمامی نەوەوی.

2- (الوابل الصيب ورافع الكلم الطيب) ئیبنولقەییم

3- (وقاية الإنسان من الجن والشيطان) وەحید عبدالسلام البالی.

4- (حصن المسلم) و(الدعاء من الكتاب والسنة ويليه العلاج بالرقي) سەعید علی قەحتانی.

5- (قەڵغانی موسڵمان بۆ خۆپاراستن لە پیلانەکانی جنۆکە و شەیتان) تاریق محمدامین.

6- (قەڵغانی مسوڵمان لە زیکرەکانی ڕۆژانە و شەوانە لە قورئان و سوننەتدا) حەمزە بەرزنجی.

---

(1) سورة الاسراء: (82).

# بەشی دووەم

## گەورەیی و فەزڵی فێربوونی قورئانی بەڕێز و بە پێز

**لەم بەشەدا:**

* چەند بابەتێکی پەیوەست.

**بابەتی یەکەم:** هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەری خوا -صلی الله علیە وسلم- و هاوەڵە بەڕێزەکانی و شوێن کەوتوانیان بۆ فێربوونی قورئان و فێرکردنی دەوروبەریان

**بابەتی دووەم:** قورئان و شەهیدی

**بابەتی سێیەم:** بە هەڵە فێربوون و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی بەرامبەر بە هەڵە، هەڵەیەکی گەورەیە

**بابەتی چوارەم:** سەرەڕای فێربوونی قورئان، گەلێك ئەرك و پێویستی تریش هەن کە پێویستە مسوڵمان فێری بێ و دەوربەریشی فێربکات، کە ئەم تەوەرانە لەخۆ دەگرێ:

تەوەری یەکەم: بەلگەکان لەسەر هەبوونی ئەرکی سەرپەرشتیار لە فێرکردن و شارەزاکردنی خاوخێزانی

بەلگەکان لە قورئانی مەزن

بەلگەکان لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم)

بەلگەکان لە قسەی نەستەقی زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ

تەوەری دووەم: هۆکار و شێوازەکانی فێرکردنی خاوخێزان

ڕێگەو شێوازی یەکەم: بۆ خۆی هەڵبستێ بە فێرکردنیان

ڕێگەو شێوازی دووەم: بۆ خۆی بچێ یان یەکێك بنێرێ بۆیان لە زانایان پرسیاربکا

ڕێگەو شێوازی سێیەم: سەرپەرشتیار هەستێ بە دابین کردن و جێبەجێکردنی کەرەستەو پێداویستیەکانی پەروەردە و فێربوون بۆ خاوخێزانەکەی و ڕێگەدانیان بۆ چوونە مزگەوت و کۆڕەکانی زانست و زانیاری

تەوەری سێیەم: ئەرك و پێویستی یەکان

تەوەری چوارەم: کات و ساتی گونجاو بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵ

ئاشکرایە گەر کەسێك یەکێکی خۆش بوێ ئەوا بەوپەڕی توانا هەوڵ دەدات فەرمان و ڕێنموونییەکانی جێبەجێ بکا و لە بوارەکانی ژیانییدا بیانهێنیتە دی، بۆیە گەر چاوێك بە مێژووی زێڕینی ئیسلامی دا بخشێنین دەبینین ئەو کەسانەی خوای پەروەردگاریان لە نەفسی خۆیان زیاتر خۆش ویستووە زۆر بە پەرۆش و بە دڵێکی پڕ لە شەوقەوە ڕوویان کردۆتە قورئانی مەزن و بە جەستە و گیان لەگەڵی تێکەڵاو بوون، هەوڵی زۆر و بێ ووچانیان داوە بۆ فێربوون و خوێندنەوە و پاشان فێرکردن و لەبەرکردنی و کار پێکردنی، چونکە قورئانی مەزن کەلام و فەرموودەی خوایە، پەیڕەوکردنی فەرموودەی خواش نیشانەی خۆشویستنی خوایە.

جا بەویستی خوا بە چەند بەڵگەیەك لە قورئان و فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی فەزڵ و پیرۆزی فێربوونی قورئانی بەرێز و چەند بابەتێکی پەیوەست بە هیوای سوود لێ وەرگرتن و پیادەکردنی باسیان لێوە دەکەین.

لە عوسمانی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لە سەر بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ ))[1].

واتە: ((چاکترینتان ئەو کەسەیە هەوڵ دەدا خۆی فێری قورئان ببێ و پاشان کەسانی تریش فێر بکات)).

عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه أن رجلاً قال: يا رسول الله اشتريت مقسم بني فلان فربحت فيه كذا وكذا، قال: (ألا أنبئك بما هو أكثر منه ربحاً)؟ قال: وهل يوجد؟ قال: (رجل تعلم عشر آيات)، فذهب الرجل فتعلم عشر آيات، فأتى النبي صلى الله عليه وسلم فأخبره)[2].

---

(1) رواه البخاري (5027).

(2) قال الهيثمي في مجمع الزوائد (7/165): رواه الطبراني في الأوسط (2872) والكبير (8012) ورجاله رجال الصحيح.

واتە: (لە ئەبو ئومامەی باهلییەوە ڕەزای خوای لێ بێ پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو بەشەی فلانە تیرەم کڕیوە و ئەوەندە و ئەوەندەم لێ قازانج کردووە.

پێغەمبەر فەرمووی: ((ئایا هەواڵت پێ بدەم بەوەی کە لەوە زیاتری قازانج بێ؟)).

گوتی: جا هەیە؟

فەرمووی: ((پیاوێک فێری[1] دە ئایەت بێ)). ئیدی پیاوەکە ڕۆیشت و چوو فێری دە ئایەت بوو. دوایی هاتەوە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هەواڵی فێربوونی دە ئایەتەکەی پێدا).

شافعی ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ دەڵێ: (من تعلم القرآن عظمت قيمته، ومن نظر في الفقه أو من تفقه نبل قدره، ومن كتب الحديث قويت حجته، ومن نظر في اللغة رق طبعه، ومن نظر في الحساب جزلَ رأيه، ومن لم يصن نفسه لم ينفعه علمه)[2].

واتە: (هەر کەسێک فێری قورئان بێت مەزن دەبێ و سەنگ و نرخی زیاد دەبێ ....).

کاک فرهاد برادۆستی دەڵێ:

سڵاوی لێبێ سەروەری خۆمان
لەدەمی پاکی هاتووە بۆمان
خوێندنی قورئان بەسوودو بەکەڵکە
کەسێکی ئاوا چاکترین خەڵکە
قورئانی پیرۆز هەردەم بخوێنێ
خەڵکیش فێربکا و تێبگەیەنێ

---

(1) فێربوون: لەبەرکردن و لێ شارەزابوونی قورئانیش دەگرێتەوە.

(2) صفة الصفوة لابن الجوزي (2/ 169)، وطبقات الشافعية للسبكي (2/ 99).

## چەند بابەتێکی پەیوەست

**بابەتی یەکەم: هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم و هاوەڵە بەڕێزەکانی و شوێنکەوتوانیان بۆ فێربوونی قورئان و فێرکردنی دەوروبەریان:**

ئەوەتا خوای گەورە لە چەندان ئایەت باسی هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم دەکات، کە چەندە داکۆکی کردووە لە فێرکردنی هاوەڵە بەڕێزەکانی وخەڵکی دەوروبەری، وەکو دەفەرموێ: ﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾[1].

واتە: (( هەروەکو –بۆ تەواوکردنی نازو نیعمەتم– لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لەخۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە– دڵو دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراتان– خاوێن دەکاتەوە و فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی).

لە جابری کوڕی عبداللە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُعَلِّمُ أَصْحَابَهُ الاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا، كَمَا يُعَلِّمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ ...))[2].

واتە: (پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەك چۆن سورەتێکی قورئانی مەزنی فێردەکردین ئاواش ئیستیخارەی لە هەموو کاروبارێکدا فێر دەکردین...). دیارە لە فێرکردنی ئیستخارەدا نمونە بە فێرکردنی قورئانی

---

(1) سورة البقرة: (151).

(2) رواه البخاري (7390).

مەزن هێنراوەتەوە کە نیشانەی زۆر گرنگی دانی پێغەمبەری خوا بووە بۆ فێرکردنی هاوەڵەکانی و شارەزاکردنیان بە قورئانی مەزن. وە هەروەها لەم فەرموودەیەشدا: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ يَقُولُ « قُولُوا اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ))[1].

وەهەروەها دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا و شوێنکەوتوانیان سەبارەت بە گرنگی دانیان بە فێربوون و فێرکردنی قورئانی بەرز چەند نمونەیەك دەهێنینەوە:-

لە بەرائی کوری عازەبەوەخوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ((أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم مُصْعَبُ بْنُ عُمير وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَجَعَلاَ يُقْرِئَانِنَا الْقُرْآنَ))[2].

واتە: (یەکەم کەسانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا لە مەدینە هاتنە لامان: موصعبەی کوری عومەییر و عبداللەی کوری ئوم مەکتوم بوو، کە فێری قورئانیان دەکردین).

عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه أنه مر ذات يوم في موضع من نواحي الكوفة فإذا فتيان فساق قد اجتمعوا يشربون وفيهم مغن يقال له: زاذان يضرب ويغني وكان له صوت حسن فلما سمع ذلك عبدالله قال: ما أحسن هذا الصوت لو كان بقراءة كتاب الله! وجعل الرداء على رأسه ومضى فسمع زاذان قوله فقال: من كان هذا؟ قالوا: عبد الله بن مسعود صاحب رسول الله – صلى الله عليه وسلم– قال: وأي شيء قال؟ قالوا: إنه قال: ما أحسن هذا

---

(1) رواه مسلم (590)، وابن حبان (999).

(2) رواه البخاري (4941).

الصوت لو كان بقراءة كتاب الله تعالى. فقام وضرب بالعود على الأرض فكسره ثم أسرع فأدركه وجعل المنديل في عنق نفسه وجعل يبكي بين يدي عبد الله بن مسعود فاعتنقه عبد الله بن مسعود وجعل يبكي كل واحد منهما ثم قال عبد الله: كيف لا أحب من قد أحبه الله –عز وجل– فتاب إلى الله –عز وجل– من ذنوبه ولازم عبد الله بن مسعود حتى تعلم القرآن وأخذ حظاً من العلم حتى صار إماماً في العلم.

واته:( لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ کە ڕۆژێکیان بە ناوچەیەك لە دەوروبەری کوفەدا تێدەپەڕێ.. هێندێك لە فاسیقەکانی تێدا کۆبووبونەوە و لە ناویشیاندا گۆرانی بێژێك هەبوو.. پێی دەگوترا زاذان کە دەفەی دەکوتاو گۆرانی دەگوت.. دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو. کاتێك عبدالله بە لایاندا تێدەپەڕێ.. گۆرانی زاذان دەبیستێ و دەڵێ: ئەم دەنگە چەند خۆشە ئەگەر بۆ خوێندنەوەی قورئان بوایە، ئیدی چارۆکەکەی بەسەر سەری دا بەردایەوە و ڕۆیشت.

(زاذان)یش قسەکەی عبداللەی بیست و گوتی: ئەمە کێ بوو؟

گوتیان: عبداللەی کوڕی مەسعود. هاوەڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

گوتی: چی گوت؟

گوتیان: گوتی: ئەم دەنگە چەند خۆشە ئەگەر بۆ خوێندنەوەی قورئان بوایە. بەمە گەورەیی و هەیبەت چووە ناو دڵی و هەستایە سەر پێ و سازەکەی بە زەوی دادا و شکاندی، پاشان بە پەلە ڕۆیشت و خۆی گەیاندە عبدالله و لە بەردەمیدا دەستی کردە گریان.. ئیدی باوەشیان کردە یەکتر و هەردووکیان گریان.

ئینجا عبدالله گوتی: چۆن کەسێکم خۆش نەوێ کە خوا خۆشی دەوێ[1].
زاذان گەڕایەوە و وازی لە گوناه هێنا و خۆی پەیوەست کرد بە عبدالله ..
هەتا فێری قورئان بوو. وە هەتا پشك و بەشێکی زۆری لە زانست و زانیاری
قورئان وەرگرت و بووە پێشەنگ لە زانیاری).

محمدی کوڕی عبدالباقی کوڕی محمدی بەزازی ئەنساری دەڵێ: من لە
مەککە بووم.. ڕۆژێك لە ڕۆژان دووچاری برسییەتی و هەژارییەکی توند
هاتم و هیچ شتێکم دەست نەکەوت برسیەتییەکەمی پێ نەهێڵم.. لە ڕێگادا
کیسێکی ئاوریشمم دۆزییەوە کە سەرەکەی بە داوی ئاوریشم قایم کرابوو..
هەڵم گرتەوە و هێنامەوە ماڵێ. کە کردمەوە و سەیرم کرد ملوانکەیەکی لە
مرواری دروست.کراوی تێدایە.. هەرگیز شتی وا جوان و قەشەنگ و نایابم
نەبینیبوو کە چوومە دەرەوە پیاوێکی پیر بانگی دەکرد و کیسەیەکی لە لا
بوو پێنج سەد (500) دیناری زێڕی تێدا بوو دەیگوت ئەمە بۆ ئەو کەسەیە
کیسە مرواریەکە بگێڕێتەوە.
منیش گوتم: من پێویستم و زۆریشم برسییە. وا چاکە ئەو پارەیەی لێ
وەرگرم و کیسە مرواریەکەی بۆ بگێڕمەوە.
پێم گوت: وەرە لام.. ئەوە بوو پێکەوە چوینەوە ماڵەوە و هەموو
نیشانەکانی گوت، هەر لە جۆری کیسەکە و ژمارەی مروارییەکان و ئەو
داوەی پێی بەسترا بوو. بۆم هێنا و دامەوە دەستی.. ئەویش لە پاداشتی دا
پێنج سەد (500)دینارەکەی دایە دەستم، منیش وەرم نەگرت و گوتم: لە
سەرم پێویستە بیگێڕمەوە و هیچ لە پاداشتی وەرنەگرم.
ئەویش پێی گوتم: هەر دەبێ وەری گری .. زۆری لێ کردم .. بەڵام من
هەر وەرم نەگرت.. ئیدی وازی لێ هێنام و ڕۆیشت.

---

(1) ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة.

بەڵام حاڵ و گوزەرانی من وای لێ کردم لە مەککە دەرچم.. سەفەرم کرد و سواری کەشتی بووم.. لە سەفەرەکەدا کەشتیی‌یەکە شکا و خەڵکەکە نقوم بوون.. سەروەت و سامانیان لەناوچوو.. منیش بە هۆی پارچەیەك لە داری کەشتیی‌یەکە ماوەیەك لە ناو دەریا مامەوە، نەمدەزانی بەرەو کوێ و چی بکەم.. دوایی خوای گەورە بە هۆی شەپۆڵەکانی دەریا بەرەو دوورگەیەکی ئاوەدانی بردم، لەوێ لە یەکێك لە مزگەوتەکانی دوورگەکە نیشتەجێ بووم، کە بیستیان قورئان دەخوێنمەوە کەسێك لە دوورگەکە نەما نەیەت بۆ لام و گوتیان: دەبێ فێری قورئانمان بکەی.. ئەوە بوو بە هۆی ئەمەوە سامانێکی زۆریان بۆ کۆکردمەوە و یارمەتی‌یەکی زۆریان دام. ئینجا هەندێك لاپەڕەی قورئانم لە مزگەوتەکەدا بەرچاو کەوت منیش هەڵم گرتن و لە سەرم خوێند. خەڵکەکە گوتیان: باش دەزانی بنووسی؟ منیش گوتم: بەڵێ. گوتیان: فێری نووسینمان بکە.. منداڵ و گەنجەکانی خۆیان هێنا و منیش فێرم دەکردن، لەمەشدا پارە و سامانێکی زۆرم دەست کەوت و یارمەتی‌یان دام.

دوای ماوەیەك پێیان گوتم: کچێك هەیە دایك و باوکی نەماوە هەندێك لە سامانی دونیاشی هەیە.. دەمانەوێ خوازبێنی بکەین و ببێتە خێزانت. منیش ڕازی نەبووم! گوتیان: هەر دەبێ خوازبێنی بکەی! زۆریان لێ کردم و منیش ڕازی بووم، کاتێك ڕازاندیانەوە و بۆیان هێنام .. بۆیم ڕوانی و سەیرم کرد چاوم کەوت بەو ملوانکەیەی کاتی خۆی دۆزیبومەوە.. زۆر سەرسامی کردم و چاوم لە ڕوانینی ملوانکەکە لانەدا.

ئەوانیش گوتیان: ئەی مامۆستا! دڵی کچەت شکاند بە سەیرکردنت بۆ ملوانکەکە نەوەکو کچەکە! منیش بەسەرهاتی ئەو ملوانکەیەم بۆ گێڕانەوە.. هەموویان بە (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) کردن دەنگیان هەڵبڕی..

منیش گوتم: ئەوە چیتانە بۆ وادەکەن؟

گوتیان: ئەو پیاوە پیرەی کاتی خۆی ئەو ملوانکەیەی لە تۆ وەرگرتەوە باوکی ئەو کچەیە.. دەیگوت: لە دونیادا کەسی مسوڵمانی وام نەبینیوە وەکو ئەو پیاوەی کیسە مرواریەکەی دایەوە دەستم.. وە نزای دەکرد و دەیگوت: خوای پەروەردگارم من و ئەو پیاوە پێکەوە کۆ بکەیتەوە تاوەکو کچەکەمی لێ مارەبڕ بکەم! وە گوتیان: ئەوە ئێستاش نزاکەی هاتە دی. ئیدی لەگەڵ خێزانەکەم ماوەیەك ژیاین.. خوای میهرەبان و بە بەزەیی دوو مناڵی پێ بەخشین.

دوایی خێزانەکەم مرد.. مرواریەکانی بۆ من و دوو منداڵەکەم جێ هێشت.. پاشان ئەوانیش مردن و مرواریەکان بۆ من مایەوە و منیش دوایی بە (100) سەد هەزار دینار فرۆشتم، ئەو پارەیەی ئێستا لەبەردەستمە و ئێوە دەیبینین ئەوە لە پاشماوەی ئەو سامانەیە[1].

* گەنجێکی نەخوێندەوار بە یارمەتی ئیمانداریك لە مزگەوت هەوڵی دا فێری قورئانی مەزن بێ. دوای ماندووبوون و هەوڵ و تێکۆشانی زۆر سوپاس بۆ خوا توانی فێری خوێندەواری ببێ و ئێستا ئەوەی من ئاگاداربم قورئانیشی خەتم کردووە و بە ئەندازەیەکی زۆر چاکیش پەیوەستە بە ئیسلامەوە.

کەواتە:دوای یارمەتیو تەوفیقی خوای گەورە هەر کەسێك با نەخوێندەواریش بێ هەوڵ بدا فێری قورئانی مەزن بێ فێردەبێت، وەئەگەر فێربوونی قورئان لای مامۆستایەك نەکرا و نەڕەخسا ئەوا دەتوانێ لە ڕێگەی کاسێت و تەسجیلەوە فێربێ و لەسەری بخوێنێ.

(1) ذکره الحافظ ابن رجب الحنبلي في ذيل الطبقات الحنابلة (1 196) کە لە (روائع وطرائف)ی ابراهیم نعمة (جزء 2 ، 69) نەقلم کردووە.

**پرسیار[1]: ئایا ڕێگە دراوە مرۆڤی کافر فێری قورئانی بەرز بکرێ ؟**

وەڵام: ئەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: هاوبیرانمان گوتیانە: ئەگەر ئومێد لە مسوڵمان بوونی نەدەکرا فێرکردنی جائیز نیە، بەڵام ئەگەر ئومێد لە مسوڵمان بوونی دەکرا ئەوا دوو ڕووی هەیە:

ڕووی یەکەم: کە ڕاسترینیانە، جائیزە فێری قورئان بکرێت بە ئومێدی مسوڵمان بوونی.

ڕووی دووەم: فێرکردنی جائیز نییە، هەروەکو چۆن قورئان پێ فرۆشتنی جائیز نییە با ئومێد لە مسوڵمان بوونیشی بکرێ.

بەڵام ئەگەر بینیمان هەوڵی فێربوون و شارەزابوونی قورئانی دەدا ئایا قەدەغە دەکرێ ؟

وەڵام: ئەمەشیان وەکو ئەمەی ڕابردوو دوو ڕووی هەیە.

**بابەتی دووەم: قورئان و شەهیدی:**

لەبەر تامەزرۆیییان بۆ قورئانی بەرز و پاک و گرنگی فێرکردنی دەوروبەر مسوڵمانان هی وایان هەبووە لەم پێناوەدا بە پلەی شەهادەت و شەرەف گەیشتوون:

((عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ قَالَ جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَقَالُوا أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقُرَّاءُ فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِى الْمَسْجِدِ وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ وَلِلْفُقَرَاءِ فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ –صلى الله عليه وسلم– إِلَيْهِمْ فَعَرَضُوا لَهُمْ فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ. فَقَالُوا اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا –قَالَ– وَأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خَالَ

(1) بڕوانە: التبيان في آداب حملة القرآن للنووي (ص 126).

أنس من خلفه فطعنه برمح حتى أنفذه. فقال حرام فزت ورب الكعبة. فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم لأصحابه « إن إخوانكم قد قتلوا وإنهم قالوا اللهم بلغ عنا نبينا أنا قد لقيناك فرضينا عنك ورضيت عنا »)[1].

وفي رواية البخاري (2801) فدعا عليهم أربعين صباحا. على رعل وذكوان وبنى لحيان وبنى عصية الذين عصوا الله ورسوله صلى الله عليه وسلم.

واتە: (ئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: چەند کەسێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گوتیان: پیاوانێکمان لەگەڵ بنێرە تا قورئان و سوننەتمان فێربکەن، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم حەفتا کەس لە پشتیوانانی بۆ ناردن کە پێیان دەگوترا (قورئان لەبەرەکان)، حەرامی خاڵمیانی تێدا بوو. قورئانیان دەخوێند و بە شەو دەوریان دەکردەوە و فێری دەبوون. بە ڕۆژیش ئاویان بۆ مزگەوت دەهێنا و دایان دەنا.. داریان دەکرد و دەیان فرۆشت و خواردنیان پێ دەکڕی بۆ ئەهلی صوففە. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ناردنی و ئەوانیش ڕێگەیان پێگرتن و هەموویان کوشتن پێش ئەوەی بگەنە ئەو شوێنە. گوتیان: خوایە بە پێغەمبەرەکەمان ڕابگەیەنە کە ئێمە بە خزمەت تۆ شادبووین و لێمان ڕازی بویت ئێمەش لە تۆ ڕازی بووین.

دەڵێ: پیاوێك دێت بۆ حەرامی خاڵی ئەنەس لە پشتەوە لێیدەدا تاوەکو دیوە دەری دەکات. ئینجا حەرام دەڵێ: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە سەرفراز بووم.

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵانی ڕادەگەیەنێت و دەفەرموێ: "براکانتان کوژران و گوتیان: خوایە بە پێغەمبەرەکەمان ڕابگەیەنە کە ئێمە بە خزمەت تۆ شادبووین و لێمان ڕازی بوویت و ئێمەش لە تۆ ڕازی بووین").

---

(1) رواه مسلم (677).

وەلە ڕیوایەتی بوخاریدا: (پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چل (40) ڕۆژ لە نوێژی بەیانیاندا دوعای لە (ڕیعل و زەکوان و بەنی لیحیان و بەنی عوصەییە کرد، ئەوانەی لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی بوون).

ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و شوێن کەوتوانیان، بەڕاستی تا دوا دڵۆپی خوێنیان بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خوا لە زەوی و بڵاوکردنەوەی بە هەموو شوێنەکان کۆڵیان نەدا، وە هەموو کاتێك ئامادە و گیان لەسەر دەست بوون بۆ ڕزگارکردنی بەندەکان لە بەندایەتی بەندە و شەیتانەکان بۆ تەنها بەندایەتی کردنی خوای بەندەکان.

وەلە وەفاداری ئێمەیە بۆ ئەوان دەست بگرین بەم ئایینە پاکەی کە ئەوان لە پێناویدا بوونە قوربانی و گیانی خۆیان بۆ خوا بەخت کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی تەنها ووشەی خوا بەرز بێت لە زەوی.

جا ئایا دەرهەق بە ئەوان وەفادار دەبین؟ وە ئایا دەبینە چاکترین دواین بۆ چاکترین پێشین؟

**بابەتی سێیەم: بە هەڵە خوێندنەوە و فێربوونی قورئان و فێرکردنی بەرامبەر بە هەڵە، هەڵەیەکی گەورەیە:**

دەبێ لەوە ئاگاداربین فێرکردنی بەرامبەر لەم فەرموودەیەدا کە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) کاتێك دەبێت کە خۆت چاك فێر بوو بیت، هەروەکو لە فەرموودەکەدا ئاماژەی پێ کراوە (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ) ئینجا (وَعَلَّمَهُ). چونکە بە هەڵە فێربوون و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی بەرامبەر بەم شێوەیە هەڵەیەکی گەورەیە، وەکو لەم بەسەرهاتەدا:

قورتوبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە: عن ابن أبي مليكة قال: قدم أعرابي في زمان عمر بن الخطاب رضى الله عنه فقال: من يقرئني مما أنزل

على محمد صلى الله عليه وسلم؟ قال: فأقرأه رجل "براءة"، فقال: " أن الله بريئ من المشركين ورسولِه " بالجر. فقال الأعرابي: أو قد بريئ الله من رسوله؟ فإن يكن الله بريئ من رسوله له فأنا أبرأ منه. فبلغ عمر مقالة الأعرابي: فدعاه فقال: يا أعرابي أتبرأ من رسول الله -صلى الله عليه وسلم-؟ فقال يا أمير المؤمنين، إني قدمت المدينة ولا علم لي بالقرآن، فسألت من يقرئني، فاقرأني هذا سورة "براءة" فقال: " إن الله بريئ من المشركين ورسوله "، فقلت أو قد بريئ الله من رسوله، إن يكن الله بريئ من رسوله فأنا إبرأ منه، فقال عمر: ليس هكذا يا أعرابي، قال: فكيف هي يا أمير المؤمنين؟ قال ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾[1]، فقال الأعرابي: وأنا أبرأ مما بريئ الله ورسوله منه، فأمر عمر ابن الخطاب رضى الله عنه ألا يقرئ الناس إلا عالم باللغة[2].

واتە: (دەشتەكی‌یەك هاتە مەدینەی ڕۆشن، گوتی: كێ هەیە لەوەی بۆ محمد صلی الله علیه وسلم دابەزیوە بۆم بخوێنێتەوە و فێرم بكا؟ پیاوێكیش سوڕەتی بەڕائەتی بۆ خوێندەوە تا گەیشتە ئەم ئایەتە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾ كە ووشەی ﴿وَرَسُولُهُۥ﴾ بە (رسوله) بۆ خوێندەوە كە مانای دەگۆڕێ و دەبێتە: خوا لە هاوبەش پەرستان و پێغەمبەرەكەی بەری‌یە). دەشتەكی‌یەكەش گوتی: وە هەروەها منیش لە پێغەمبەرەكەی بەری دەبم..

ئەمە لە لای خەڵك دەنگی دایەوە و مەسەلەكە گەیشتە ئەمیری ئیمانداران عومەر ڕەزای خوای لێ بێ. ئەویش بانگی دەشتەكی‌یەكەی كرد و پێی گوت: ئەی ئەعرابی ئایا لە پێغەمبەری خوا بەری دەبیت؟ دەشتەكەیەكەش گوتی:

---

(1) سورة التوبة: (3).

(2) أحكام القرآن للقرطبي (1 24).

ئەی پێشەوای ئیمانداران، هاتمە مەدینە پیاوێك سورەتی تەوبەی بۆ خوێندمەوە، منیش گوتم ئەگەر خوا لە پێغەمبەرەکەی بەری بێ ئەوا منیش بەری دەبم. عومەر گوتی: ئەو ئایەتە بەم شێوەیە نییە؟! گوتی: ئەی چۆنە ئەی ئەمیری ئیمانداران؟! ئەویش بە شێوەی ﴿ وَرَسُولُهُۥ ﴾ بۆی خوێندەوە. ئەعرابییەکەش گوتی: سوێند بە خوا منیش بەریم لەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی لێی بەرین.

ئیتر عومەر بڕیاری دا و فەرمانی کرد کە لەمەودوا جگە لە زانایان بە واتاو زمانی قورئان کەسێکی تر نابێ قورئان فێری خەڵکی بکات).

* ئەو ساڵەی لە پۆلی شەشەمی زانستی دەم خوێند.. کاتێك لەوانەی پەروەردەی ئیسلامی گەیشتینە ئەم دەقە قورئانییە کە بە ئایەتی ﴿ ۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾[1] دەست پێ دەکات، ماموٚستاکەمان گوتی: نابێ بەم شێوەیە ﴿ ۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ ﴾ بخوێندرێتەوە بەڵکو دەبێ (ليس البرُّ) بخوێندرێتەوە. ئێمەی قوتابیش گوتمان: بۆچی ماموٚستا؟! گوتی: لەبەر لایەنی ڕێزمانییەکەی ئاوا ڕاستە، گوتمان ئاخر ماموٚستا! ئایەتەکە بەم شێوەیە ڕاست نییە کە تۆ دەڵێی. بەڵکو بەم شێوەیەیە کە لە کتێبەکەدا هاتووە، بەڵام ماموٚستا هەر نەیسەلماند و دانی بەهەڵەی خۆی نەنا.

---

(1) سورة البقرة: (177).

* وەلە مزگەوت لە چەندان خەڵکی تریش گوێ بیستی خوێندنەوەی قورئانەکەیان بووم کە بە هەڵە قوتابیەکانیان فێرکردووە.
* وەقوتابخانەی وا هەیە مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی‌یان گاورە (نەسرانی‌یە)!

**بابەتی چوارەم: سەرەڕای فێربوونی قورئان گەلێك ئەرك و پێویستی تریش هەن کە پێویستە مسوڵمان فێری بێ و دەوروبەریشی فێر بکات:**

سەرپەرشتیاران – لە پیاوان و ئافرەتان– لە سەریانە هەستن بە فێربوون و خۆ شارەزاکردن لەو ئەرك و پێویستی‌یانەی خوا و پێغەمبەرەکەیان صلی الله علیه وسلم لە سەریان داناون ئینجا دوا بە دوای ئەمە دەبێ هەریەکەیان دەست بکەن بە فێرکردن و شارەزاکردنی خاو خێزانی: (واتە: هاوسەرەکەی، کوڕ و کچەکانی، هەموو ئەوانەی لە ژێر بەرپرسیاریەتی ئەودان).
جا توێژینەوەو باس کردنی ئەم بابەتە دابەش دەکەین بە سەر چوار تەوەرەدا:

**تەوەرەی یەکەم: بەڵگەکان لەسەر هەبوونی ئەرکی سەرپەرشتیار لە فێرکردن و شارەزاکردنی خاوخێزانی:**

**بەڵگەکان لە قورئانی بەرزو بڵند:**

1- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ
بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا
عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن
جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا
مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ

تَعۡمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ
وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٧﴾
وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾
وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾[1].

واتە: (وە لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت لە کاتێکدا ئامۆژگاری دەکرد: کوڕە شیرینەکەم، نەکەی شتێك یان کەسێك بە هاوتا و هاوبەشی خوا بڕیار بدەیت، چونکە بەڕاستی هاوتا و هاوبەش بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورە و ناڕەوایە. لێرەدا خوای گەورە خۆی ئامۆژگاریمان دەکا و دەفەرمویٚ: ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد بە چاك ڕەفتار بکات لە گەڵ دایك و باوکی، دایکی بە ئێش و ئازار و لاوازی و بیٚ تاقەتیەکی زۆرەوە بە پێستی سکی نۆ مانگ هەڵی گرتووە، بڕینەوەشی دوای دوو (2) ساڵە، فەرمانمان پێدا کە ئەی مرۆڤ سوپاسگوزاری من و دایك و باوکت بە، دڵنیا بن گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە. ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبیٚ هیچ بەڵگەو زانیاریەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت -هەر چەندە هیچ بەڵگەو زانیاریەکیشی لەسەر نیە- ئەوە فەرمانبەرداریان مەبە و بە قسەیان مەکە، لە دونیاشدا هاوڕیٚ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان، شوێن ڕێبازی ئەوانە بکەوە کە بۆ لای من گەڕاونەتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، جا هەواڵتان دەدەمیٚ بەو کار و کردەوانەی کە دەتان کرد.

پاشان خوای گەورە لە سەر زمانی لوقمان دەفەرمویٚ: ئەی کوڕی ئازیزم، بە ڕاستی ئەگەر گوناهێك بە قەدەر تۆوی خەرتەلەیەك -کە زۆر ووردە-

---

(1) سورة لقمان: (13-19).

هەبێت و لە ناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان یان لە زەوی دا حەشار درابێت لای خوا شاراوە نیەو دەیهێنێتە مەیدان، بە ڕاستی خوای گەورە زۆر بەلوتف و شارەزایە. کوڕی شیرینم، نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە. فەرمان بە چاکەو قەدەغە لە گوناه و خراپە بکە. بە ئارام بە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی تووشت دەبێت. بە ڕاستی ئەوانەی باس کران هەندێکن لەوانەی هەر دەبێت بکرێن. هەروەها ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی و-لووت بەرز مەبە، بەچاوی سووک سەیریان مەکە- بە سەر زەویدا بە ناز و فیزەوە مەڕۆ. بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆ هەڵکێش و فەخر فرۆش و فیزاوین، هەوڵبدە لە ڕۆیشتندا مام ناوەندیانە بڕۆ، بەرەو ئامانجێکی چاک هەنگاو بنێ، وەبە دەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکەو بدوێ، بە ڕاستی بێزارترین و ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی گوێ درێژەکانە).

2- خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾﴾[1].

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنی‌یەکەی خەڵك و بەردە، لەسەر ئەو دۆزەخ و ئاگرە جۆرە فریشتەیەك هەن کە زۆر دڵ ڕەق و توند و تیژن، نا فەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات، وە هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن).

ئیبنو کثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (قال سفيان الثوري، عن منصور، عن رجل، عن علي رضي الله عنه في قوله تعالى: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ

(1) سورة التحريم: (6).

نَارًا ﴾يقول: أدبوهم، علموهم. وقال علي بن أبي طلحة، عن ابن عباس: يقول: ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا ﴾ اعملوا بطاعة الله، واتقوا معاصي الله، ومُروا أهليكم بالذكر. ينجيكم الله من النار.وقال مجاهد: ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا ﴾ قال: اتقوا الله، وأوصوا أهليكم بتقوى الله.

وقال قتادة: يأمرهم بطاعة الله، وينهاهم عن معصية الله، وأن يقومَ عليهم بأمر الله، ويأمرهم به ويساعدهم عليه، فإذا رأيت لله معصية، قَدعتهم عنها وزجرتهم عنها.

وهكذا قال الضحاك ومقاتل: حق على المسلم أن يعلم أهله، من قرابته وإمائه وعبيده، ما فرض الله عليهم، وما نهاهم الله عنه).

ئەگەر سەرنج بدەیتە قسەی هەر یەك لەو سەحابە و پیاو چاکانە دەبینین هەموو قسەکانیان ئەگەرچی لە ڕواڵەت جیان بەڵام لە ناوەڕۆك هەموویان یەك واتایان هەیە کە بریتی‌یە لەوەی دەبێ سەرپەرشتیار خۆی بپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ بە خۆ شارەزاکردن و فێربوون و فەرمانبەرداری کردنی خوا و خۆ دوورگرتن لە سەرپێچی کردنی، پاشان پێویستە لە سەری هەستێ بە پەروەردەکردنی خاوخێزانی‌و هەموو ئەوانەی لە ژێر بەرپرسیارێتی ئەودان و فێرکردن و شارەزاکردنیان بە شەریعەتی خواو هەموو ئەو کارو کردەوانەی دەبێتە مایەی پاراستنیان لە ئاگری دۆزەخ.

**بەڵگەکان لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم:**

((حَدَّثَنَا مَالِكٌ أَتَيْنَا إِلَى النَّبِىِّ –صلى الله عليه وسلم– وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ يَوْمًا وَلَيْلَةً ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– رَحِيمًا رَفِيقًا ، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلَنَا أَوْ قَدِ اشْتَقْنَا سَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا بَعْدَنَا فَأَخْبَرْنَاهُ قَالَ « ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَأَقِيمُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ

ومُرُوهُمْ – وذَكر أشْيَاءَ أحْفَظُهَا أوْ لا أحْفَظُهَا– وَصَلُّوا كما رَأيْتُمُونى أُصَلِّى. فَإذَا حضرتِ الصَّلاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لكُمْ أحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أكْبَرُكُم))[1].

واتە: لە مالکی کوڕی حویرثەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: بەسەردان هاتینە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە ئێمە لەو کاتەدا هاوتەمەن و جەحێڵ بووین.. بیست (20) شەو و ڕۆژ لەلای ماینەوە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زۆر بە بەزەیی و میهرەبان و دڵ نەرم و بەهاوڕێیەتی بوو. ئیدی کە زانی ئێمە حەزمان لە گەڕانەوەیە بۆلای خاوخێزان و ئارەزوویان دەکەین. پرسیاری ئەوەی کرد کە لە دوای خۆمان جێمان هێشتوون. ئێمەش حاڵ و حیسابەکەمان پێ گوت.

فەرمووی: (( بگەڕێنەوە لای کەس و کارو خێزانتان و لەلایان بمێننەوە. وەفێریان بکەن و پێیان بڵێن لەوەی کەزانیوتانە. وەنوێژ بکەن هەروەکو چۆن بینیتان من نوێژ دەکەم. وەئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بداو ئەوەی لە هەمووتان گەورەترە[2] پێش بکەوێ)).

**بەڵگەکان لە قسەی نەستەقی زانایان - ڕەحمەتی خوایان لێ بێ -:**

نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (قال الشافعي والاصحاب رحمهم الله على الآباء والامهات تعليم أولادهم الصغار ما سيتعين عليهم بعد البلوغ فيعلمه الولى الطهارة والصلاة والصوم ونحوها ويعرفه تحريم الزنا واللواط والسرقة وشرب المسكر والكذب والغيبة وشبهها: و يعرفه أن بالبلوغ يدخل في التكليف ويعرفه ما يبلغ به: وقيل هذا التعليم مستحب والصحيح وجوبه وهو ظاهر نصه و كما يجب عليه النظر في ماله و هذا أولى وانما المستحب ما زاد على هذا من تعليم القرآن و فقه وادب: ويعرفه ما يصلح به معاشه ودليل وجوب تعليم الولد الصغير والمملوك قول الله عزوجل: (يا أيها الذين آمنوا

---

(1) رواه البخاري (631).

(2) لە بەرگی دووەم - إنشاءالله- بە تێروتەسەلی باسی ئەوە دەکەین کە کێ شایەنترە پێشنوێژی بکات.

قوا أنفسكم وأهليكم نارا).قال علي بن ابى طالب رضى الله عنه ومجاهد وقتادة معناه علموهم ما ينجون به من النار وهذا ظاهر: وثبت في الصحيحين عن ابن عمر رضى الله عنهما عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: كلكم راع ومسئول عن رعيته)[1].

واتە: شافیعیو هاوەڵان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: لە سەر باوکان و دایکان پێویستە منداڵە بچووکەکانیان فێری ئەوانە بکەن کە بۆ دوای باڵغ بوون بۆیان دەبێتە پاڵپشت و یارمەتیدەر، وەلە سەریانە منداڵ فێری پاك و خاوێنیو نوێژ و ڕۆژوو و هاوشێوەی ئەمانە بکەن، وەحەڕامی زیناو نێربازیو دزیو خواردنەوەی ئارەق و درۆ و غەیبەت و هاوشێوەی ئەمانەی پێ بناسێنێ، وەپێی ڕابگەیەنێ کە بە باڵغ بوون دەچێتە ناو ئەو ئەرك و پێویستیانەو دەبێ هەموو ئەو ڕێگایانەی پێ بناسێنێ کە دەیگەیەنێتە ئەمە. وە گوتراوە ئەم فێرکردنە لە سەر دایك و باوك سوننەتە و واجب نییە، بەڵام ئەوەی ڕاست و دروست بێ واجبە، وەئەمەش ڕواڵەتی دەقەکەیە، بەڵکو ئەوەی سوننەتەو واجب نییە بریتییە لە زیاد لەمانەی لە سەرەوە باس کران: لە فێرکردنی قورئان و فیقە و ئەدەب و ئەوەی باشە بۆ بژێوی ژیانی، وەبەڵگەی واجب بوونی فێر کردنی منداڵ و ئەوەی لە ژێر دەستی دایە فەرموودەی خوای گەورەیە:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا ﴾[2].

عەلی کوڕی ئەبو تالب و موجاهید و قەتادە دەڵێن: فێریان بکەن لەوەی دەبێتە هۆی ڕزگاربوونیان لە ئاگر. ئەمەش ئاشکرا و دیارە، لە صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:((هەمووتان چاودێرن وەهەمووتان بەرپرسن لەوەی لەبەر دەستتان دایە)) .

---

(1) المجموع شرح المهذب للنووي (1/ 26).

(2) سورة التحريم: (6).

2- ئیبن قودامە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( قَالَ الْقَاضِي: يَجِبُ عَلَى وَلِيِّ الصَّبِيِّ أَنْ يُعَلِّمَهُ الطَّهَارَةَ وَالصَّلَاةَ إذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ وَيَأْمُرَهُ بِهَا، وَيَلْزَمُهُ أَنْ يُؤَدِّبَهُ عَلَيْهَا إذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ. وَالْأَصْلُ فِي ذَلِكَ قَوْلُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: {عَلِّمُوا الصَّبِيَّ الصَّلَاةَ ابْنَ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا ابْنَ عَشْرٍ } رَوَاهُ الْأَثْرَمُ، وَأَبُو دَاوُد، وَالتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ.
وَهَذَا لَفْظُ رِوَايَةِ التِّرْمِذِيِّ، وَلَفْظُ حَدِيثِ غَيْرِهِ: { مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلَاةِ لِسَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا لِعَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ }.
وَهَذَا الْأَمْرُ وَالتَّأْدِيبُ الْمَشْرُوعُ فِي حَقِّ الصَّبِيِّ لِتَمْرِينِهِ عَلَى الصَّلَاةِ، كَيْ يَأْلَفَهَا وَيَعْتَادَهَا، وَلَا يَتْرُكَهَا عِنْدَ الْبُلُوغِ، وَلَيْسَتْ وَاجِبَةً عَلَيْهِ فِي ظَاهِرِ الْمَذْهَبِ[1].

واتە: (قازی عیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: واجب و پێویستە لە سەر سەرپەرشتیاری منداڵ ئەگەر ڕۆڵەکەی تەمەنی گەیشتە حەوت (7) ساڵ فێری پاك و خاوێنی و نوێژی بکا. وە ئەگەر تەمەنی گەیشتە دە (10) ساڵ فەرمانی پێی بکا بە کردنی نوێژ و پێیەوە پەیوەستی بکات، ئەگەر جێبەجێی نەکرد لێی بدا، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم: "ڕۆڵەکانتان لە حەوت ساڵی فێری نوێژ بکەن، وە ئەگەر لە دە ساڵی جێبەجێی نەکرد لێی بدە"[*] وە هەروەها فەرموویەتی"..... لە دە ساڵی جێگای نوستنیان لە یەکتر جیا بکەنەوە" وەئەم پەروەردەو فێرکردنەش دەرهەق بە منداڵ بۆ ئەوەیە مەشق لە سەر نوێژەکە بکاو پێیەوە هۆگر بێ تاوەکو لە کاتی باڵغ بوونی وازی لێ نەهێنێ، هەرچەندە ئەمەش لە قسەی دیاری مەزهەبدا بە واجب و پێویست دانانرێ لە سەر منداڵەکە).



(1) المغني والشرح الكبير لابن قدامة الحنبلي (1/647).
(*) صحيح الجامع للالباني (5868).

**تەوەری دووەم: هۆکار و شێوازەکانی فێرکردنی خاوخێزان:**

بە یەکێك لەم سێ (3) ڕێگەیەی باسیان دەکەین سەرپەرشتیار دەتوانێ هەستێ بە تێگەیاندن و شارەزاکردنی خێزان و هەموو ئەوانەی لەژێر بەرپرسیارێتی ئەودان:

**ڕێگەی یەکەم: بۆ خۆی هەستێ بە فێرکردنیان:**

((حَدَّثَنَا مَالِكٌ أَتَيْنَا إِلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ يَوْمًا وَلَيْلَةً ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم رَحِيمًا رَفِيقًا ، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلَنَا أَوْ قَدِ اشْتَقْنَا سَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا بَعْدَنَا فَأَخْبَرْنَاهُ قَالَ « ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَأَقِيمُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ – وَذَكَرَ أَشْيَاءَ أَحْفَظُهَا أَوْ لاَ أَحْفَظُهَا– وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِى أُصَلِّى، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ))[1].

واتە: لە مالیکی کوڕی حویرثەوە- ڕەزای خوای لێ بێ- دەڵێ: بەسەردان هاتینە لای پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- کە ئێمە لەوکاتەدا هاوتەمەن و جەحێل بووین.. بیست (20) شەو و ڕۆژ لەلای ماینەوە، پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- زۆر بەبەزەیی و میهرەبان و دڵ نەرم و بەهاوڕێیەتی بوو، ئیدی کە زانی ئێمە حەزمان لە گەڕانەوەیە بۆلای خاوخێزان و ئارەزوویان دەکەین پرسیاری ئەوەی کرد کە لە دوای خۆمان جێمان هێشتوون. ئێمەش حاڵ و حیسابەکەمان پێ گوت.

فەرمووی: (( بگەڕێنەوە لای کەس‌وکار و خێزانتان و لەلایان بمێننەوە، وەفێریان بکەن و فەرمانیان پێ‌بکەن و پێیان بڵێن لەوەی کە زانیوتانە، وە نوێژ بکەن هەروەکو چۆن بینیتان من نوێژ دەکەم، وە ئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدا و ئەوەی لە هەمووتان گەورەترە پێش بکەوێ)).

(1) رواه البخاري (631).

رێگەی دووەم: بۆ خۆی بچێ یان یەکێک بنێرێ بۆیان لە زانایان پرسیار بکا:

((عَنْ عَلِىٍّ قَالَ كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً وَكُنْتُ أَسْتَحْيِى أَنْ أَسْأَلَ النَّبِىَّ صلى الله عليه وسلم لِمَكَانِ ابْنَتِهِ فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ فَقَالَ «يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ»))[1].

واتە: (لە عەلیەوە ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: من پیاوێکی زۆر ئاشقاو بووم و لە بەر کچەکەیشی کە لەلام بوو شەرمم دەکرد کە لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئەمە بپرسم. جا بە (مقدادم گوت) ئەویش لێی پرسی ئەو -پێغەمبەر-یش فەرمووی: "با چووکی بشوات و دەست نوێژ بگرێ").

رێگەی سێیەم: سەرپەرشتیار هەستێ بە دابین کردن وجێبەجێکردنی کەرەستەو پێداویستییەکانی پەروەردەو فێربوون بۆ خاوخێزانەکەی ورێگەدانیان بۆ چوونە مزگەوت و کۆڕەکانی زانست و زانیاری:

عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ: قَالَتِ النِّسَاءُ لِلنَّبِىِّ _صلى الله عليه وسلم_ غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ. فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِنْ نَفْسِكَ. فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ. فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ. فَكَانَ فِيمَا قَالَ لَهُنَّ « مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ ثَلاَثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلاَّ كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاثْنَيْنِ فَقَالَ « وَاثْنَيْنِ »[2]

قال ابن حجر رحمه الله: (ووقع في رواية سهل بن ابي صلاح عن أبيه عن أبي هريرة بنحو هذه القصة فقال: (موعدكن بيت فلانة) فأتاهن فحدثهن -الى ان

---

(1) رواه مسلم (303). ورواه البخاري بلفظ آخر في باب (من استحياء فأمر غيره بالسؤال) من كتاب العلم في صحيحه (132).

(2) رواه البخاري باب: (هل يجعل للنساء يوم على حدة في العلم) (101). ومسلم (2634).

قال ابن حجر- وفي الحديث ما كان عليه نساء الصحابة من الحرص على تعلم أمور الدين)[1].

واتە: (لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕەزای خوای لەسەر بێ دەڵێ: ئافرەتان بە پێغەمبەریان گوت: پیاوان زاڵ بوون بە سەرماندا لە بارەی تۆوە، کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژێکمان لە لای خۆت بۆ دیاری بکە ، ئەویش بەڵێنی ڕۆژێکی پێدان کە لەو ڕۆژەدا ئامۆژگاری‌یان بکات، پێغەمبەریش ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێدان، ئینجا لەوەی پێی فەرموون: (هەر ئافرەتێك لە ئێوە سێ منداڵ پێش بخات و لێی بمرێ ئەوا بۆی دەبێ بە حیجاب و پەردە و بەرهەڵست لە ئاگر).

ئافرەتێکیش گوتی: دوانیش هەروایە؟

ئەویش فەرمووی: (دوانیش هەر وایە).

ئیبن حەجەر ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ دەڵێ: لە گێڕانەوەی سەهلی کوڕی ئەبو صالح لە باوکی‌یەوە لە ئەبو هورەیرەوە وەکو ئەو ڕووداوەی باسکرا هاتووە، وەپێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (شوێنی کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنمان ماڵی فلانە ئافرەت بێ) ئیتر هات و قسەی بۆ کردن.. وە ئیبن حەجەر دەڵێ: لەم فەرمایشتەدا ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێ کە ئافرەتانی سەحابی چەندە داکۆکیان کردووە لە فێربوونی کاروبارەکانی ئایین).

کەواتە: (بۆ ئافرەتان دروست و ڕەوایە بچنە مزگەوت و بەشداری نوێژی بە کۆمەڵ و لەوێ و لە غەیری ئەوێشدا فێری زانست و زانیاری بن، بەڵام دەبێ پارێز بکەن لە هەر شتێك و کارێك کە مایەی فیتنە و وورووژاندنی



(1) فتح الباري لابن حجر (1/196).

ئارەزووی پیاوان بێ. وەك پۆشینی بەرگ و پۆشاکی سەرنج ڕاکێش و خۆ بۆن خۆش کردن و زرینگەو خرینگەو لەنجەو لار کردن)[1].

وەسەرپەرشتیار دەتوانێ بۆ پاڵپشتی کردنی کرداری پەروەردەو فێرکردن جۆرەها کاسێتی ووتار و قورئانی مەزن و سرود و سی دی "CD" جۆراوجۆری بە کەڵك بۆ خاوخێزانەکەی بکڕێ و دابینی بکات، وە هەروەها دانانی کتێبخانەیەکی خنجیلانە لە ماڵەوە کە ڕازابێتەوە بە جۆرەها کتێبی بە کەڵك و بە سوود لە بواری ئایینی و زانستی و پزیشکی و ڕۆشنبیری گشتی و... هتد. هەموو ئەمانە یارمەتیدەرن بۆ پەروەردەکردن.

**تەوەری سێیەم: ئەرك و پێویستی یەکان:**

هێندێك لەو کاروکردەوانەی پێویستە سەرپەرشتیار فێری خاوخێزانی بکات ئەمانەن:

1- زانین و ناسینی پێنج پایەکانی ئیسلام.

2- زانین و ناسینی شەش پایەکانی ئیمان.

3- زانین و ناسینی بەشەکانی خوا بە یەك کردن (أقسام التوحید).

4- زانین و ناسینی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و ئیمان، واتە زانین و ناسینی کوفر و ئەوەی مرۆۆ پێی کافر دەبێ.

5- زانین و ناسینی ئەو خوا پەرستی‌یانەی بە دڵ ئەنجام دەدرێن، وەکو: دڵسۆزی (الإخلاص) و زۆر ترسان (الخشیة) و خۆشویستن (المحبة) و ترس وهیوا (الخوف و الرجاء) و پشت بە خوا بەستن (التوکل علی الله).. هتد.

6- زانینی ئەحکامەکانی پاك بوونەوە (أحکام الطهارة).

7- لەبەرکردنی سوڕەتی (الفاتحة) بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و ڕەوان.

---

(1) مسوڵمانی کامل بەرگی دووەم مامۆستا عەلی باپیر.

8- زانینی ئەحکامەکانی نوێژ (أحکام الصلاة).

9- زانینی ئەحکامەکانی زەکات، بۆ کەسێك زەکاتی لە سەر بێت.

10- زانینی ئەحکامەکانی ڕۆژوو (أحکام الصیام).

11- زانینی ئەحکامەکانی حەجی ماڵی خوا، بۆ کەسێك لە توانایدا بێ بچێت.

12- زانینی ئەحکامەکانی شوشتن و ناشتنی مردوو.

13- زانینی ئەحکامەکانی جەنگ و جیهاد.

14- زانینی ئاداب و ڕەوشتە فەرزەکان، وەکو چاکە لەگەڵ دایك و باوك، پەروەردە و فێرکردنی خاوخێزان، مافەکانی دراوسێ.. هتد.

15- زانینی چۆنیەتی تەوبە و گەڕانەوە لە تاوان ومەرجەکانی قبوڵ بوونی.

**تەوەری چوارەم: کات و ساتی گونجاو بۆ پەرومردە و فێرکردنی منداڵ[1]:**

منداڵانی ئەمرۆ نەوەی دواڕۆژن، وە بە ئەندازەی پەروەردە و فێرکردن و ئاگا لێ بوون و چاودێری کردنیان ڕۆڵەی بە خزمەت و بەوەفایان بۆ ژین ودین لێ دەردەچێ.

( قال عمرو بن العاص رضي الله عنه لحلقة قد جلسوا الى جانب الكعبة بعد أن قضي طوافه وجلس اليهم وقد نحوا الفتيان عن مجلسهم: (لا تفعلوا، أوسعوا لهم وأدنوهم والهموهم، فانهم اليوم صغار قوم يوشك أن يكونوا كبار قوم آخرين، قد كنا صغار قومٍ أصبحنا كبار آخرين )[2].

واتە: (عەمری کوڕی عاص ڕەزای خوای لەسەر بێ بە کۆمەڵێکی گوت لە خەڵکی کە لە تەنیشت کەعبەدا دانیشتبوون، پاش ئەوەی تەوافەکەی جێبەجێ کرد و لەلایان دانیشت، ئەوانیش گەنج و جەحێلیان لە کۆڕەکەیان

---

(1) ئەم بابەتە – إنشاء الله- لە بەرگی دووەمی ئەم زنجیرەیە لە باسی فەزڵ و گەورەیی لەبەرکردنی قورئانی مەزن زیاتر تاوتوێ دەکەین.

(2) الاداب الشرعية والمنح المرعية لأبن قدامة المقدسي (1، 244).

دوور خستبۆوە: پێی گوتن: (دووریان مەخەنەوە.. کۆڕەکەیان بۆ فراوان بکەن. وە نزیکیان بخەنەوە و فێریان بکەن و بخەنە ناو دڵیان .. ڕاستە ئەوانە ئەمڕۆ بچووکی ناو خەڵکین بەڵام لەوانەیە بەیانی گەورەی خەڵك بن، بە ڕاستی ئێمە لەوەو پێش بچوکی خەڵك بوین کەچی ئێستا گەورەی خەڵکین).

وەبۆ دیاری کردنی ئەو تەمەنەی پێویستە منداڵ هەوڵی لەگەڵ بدریّ و سەرپەرشتیار و باوکان دەست بکەن بە فێرکردنی ڕۆڵەکانیان بریتی‌یە لەو کاتەی ئەگەر ئەو منداڵە گفتوگۆی لەگەڵ کرا وەڵامی دایەوە و تەمیز و جیاوازی لەمابەینی چاك و خراپ و قسەکان کرد، وەکو نەوەوی ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ دەڵیّ: (ونقل القاضي عياض رحمه الله أن اهل الصنعة حدّدوا أول زمن يصح فيه السماع بخمس سنين، وعلى هذا استقر العمل. والصواب اعتبار التمييز. فان فهم الخطاب ورد الجواب كان مميزا صحيح السماع والا فلا. وروي نحو هذا عن موسى بن هارون واحمد بن حنبل)[1].

کەواتە: تەمیز کردن و ئاستی تێگەیشتنی منداڵەکە گرنگە نەوەکو ساڵ و تەمەن.

(1) التدريب للنووي (ص15).

## بەشی سێیەم

# فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی قورئانی مەزن

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾﴾[1].

واتە: (بە ڕاستی ئەوانەی کتێبی خوا کە -قورئانە- دەخوێننەوە و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجامداوە و لەو ڕزق و ڕۆزی و سامانە جۆراوجۆرانەی پێمان بەخشیون بەخشیوویانە، بە نهێنی و ئاشکرا ئەوانە بە ئومێدی بازرگانیەك ئەو کارە دەکەن کە هەرگیز نائومێد و زەرەرمەند نابن، بۆ ئەوەی خوای میهرەبانیش وەفا بکات بە بەخشینی پاداشت بۆیان و لە خەڵات و بەخششی زیاتریش بەهرەمەندیان بکات، بەڕاستی ئەو -خوا- لێخۆشبوو و سوپاسگوزارە).

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ وَالَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالتَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ وَلاَ رِيحَ لَهَا))[2].

واتە: (( وێنەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێ وەك لیمۆ وایە هەم بۆنی خۆشە و هەم تامی خۆشە، وە وێنەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان

---

(1) سورة فاطر: (29-30).

(2) رواه البخاري (5020).

ناخوێنێ وەکو خورما وایە هەر چەندە بۆن و بەرامی نیە بەڵام تامی خۆشە، وە وێنەی دووڕووی قورئان خوێن وەکو ڕەیحانە وایە هەرچەندە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە! وە وێنەی دوو ڕووی قورئان نەخوێنیش وەکو گوژاڵك وایە، بۆنی نیە و تامیشی تاڵە)).

لە عائیشەی دایکمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:((الماهر بالقرآن مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران))[1].

واتە:( "ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و بێ هەڵە و پەڵە و بەڕەوانی دەیخوێنێ لەگەڵ ئەو فریشتە گەڕۆکە بەڕێزو چاکەکارانە دایە کە لە جیهانی باڵادان. وەئەوەی قورئان دەخوێنێ و بە گران بۆی دەخوێنرێ و زەحمەتە لە سەری ئەوا دوو پاداشتی[2] هەیە").

لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (( مَنْ قَرأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلاَمٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ))[3].

واتە:(( هەر کەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێ بەو پیتە چاکەیەکی بۆ هەیە، پاداشتی چاکەش یەك (1) بە دە (10)یە، دەی من ناڵێم ﴿ الٓمٓ ﴾ یەك پیتە بەڵکو ئەلیف پیتێکە، وە لام پیتێکە، وە میم پیتێکە )).

---

(1) رواه البخاري (4937)، ومسلم (798).

(2) پاداشتێك بۆ خوێندنەوەکەی وەپاداشتێك بۆ زەحمەتیەکەی، بەڵام کۆمەڵ و دەستەی یەکەم لە حی دووەم بەرز و پاداشت زیاترن.بڕوانە: شرح رياض الصالحين للعثيمين (3:102).

(3) رواه الترمذي (2912) وقال حديث حسن صحيح، والدارمي (3311). وصحيح الجامع الصغير (5/340).

جا ئەگەر ووردبینەوە دەبینین ئێمە لەهەر جارێك خوێندنەوەی قورئاندا بە هەزاران پیت دەخوێنین. بەڕاستی -ئەگەر خوای میهرەبان لێمان وەربگرێ- پاداشتێکی گەلێ زۆرە. مەرد و جوامێر و سەرفراز ئەو کەسەیە ئەمە لە دەست خۆی نەدا. وە با دڵنیابین چی بچێنین هەر ئەوە درووێنە دەکەین. وە هەر ڕۆژێکیش بە سەرماندا بڕوات گەڕانەوەی بۆ نییە.

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:(( إذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَجْدَةَ فسجد اعْتَزَلَ الشَيْطانُ يَبْكِي يَقُولُ يَا وَيْلَهُ – وفي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ يَا وَيْلِي– أمر ابْنُ آدم بِالسُجُود فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُجُود فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ ))[1].

واتە: "کاتێك ئادەمیزاد ئایەتی سەجدە دەخوێنێ و سەجدە دەبات. شەیتان کەنار دەگرێ و دەگریەت. دەڵێ. داخ و خەفەت بۆ من. ئادەمیزاد فەرمانی پێ کرا سوژدە بەرێ و سوژدەی برد و بە هەشتی پێ دەبڕێ. منیش فەرمانم پێ کرا سوژدە بەرم سەرپێچیم کرد و ئاگری -دۆزەخ-م پێ بڕا".

هەموو ئەمانەی تا ئێستا باس کران گەورەیی و بەرزی خوێندنەوەی قورئانی مەزن بوو. ئینجا با بزانین پێشینی چاکمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ چۆن گرنگیان بە خوێندنەوەی قورئانی مەزن داوە و چەندە داکۆکیان لە سەر کردووە؟! وە چەندە هەوڵیان داوە کاتە ئایەبەکانیان دابین بکەن بۆ خوێندنەوەی قورئانی مەزن و هەر گیز ئامادە نەبن ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی ماویانە لە ژیان بە فیرۆ بچێ؟! وە سەر مەشق و چاوساغی هەمووشمان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە زیاتر قورئان خوێندنەوەکەی لەناو نوێژە سوننەتەکان بووە. ئێستاش ئێوەو چەند نمونەیەك لە ژیانی شوێنکەوتوانی:

---

(1) رواه مسلم (81)، وابن ماجة (1052)، وابن حبان (2759).

عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (لو ان قلوبنا طهرت ما شبعنا من كلام ربنا، وأني لأكره أن يأتي على يوم لا أنظر في المصحف. وما مات عثمان حتى خرق مصحفه من كثرة ما كان يديم النظر فيه )[1].

واتە:(ئەگەر دڵەکانمان پاك و خاوێنو بێخەوش بن ئەوا هەرگیز لە قسەو فەرموودەی پەروەردگارمان تێر نابین، وەمن بە پەسندی نازانم و لام ناخۆشە ڕۆژێك بێتە سەرم و سەیری قورئانی مەزن نەکەم و نەیخوێنمەوە). وەخێزانەکەی دەڵێ: عوسمان شەهید نەبوو هەتا قورئانەکەی پارچە پارچە بوو لەبەر زۆر لەسەر خوێندنەوەی.

بۆیە هەر کاتێك ئیماندار لە قورئان جوودابوەوە ئەگەر لەبەر پێویستی و پشوودانیش بێ پەژارە دایدەگرێ و وادەزانێ وەکو ماسی لە خۆشەویسترین شتی کە ئاوە دابڕاوە.

عبدالله ی کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:"أديموا النظر في المصحف"[2].

واتە:(بەردەوام سەیری قورئان بکەن و لە سەری بخوێننەوە).

حەبیبی کوڕی شەهید دەڵێ: بە نافع گوترا: (ما كان يصنع ابن عمر رضي الله عنهما في منزله؟ قال: لا يطيقونه، الوضوء لكل صلاة والمصحف فيما بينهما)[3].

واتە:(ئایا عبداللەی کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ لە ماڵەوە چی دەکرد؟ گوتی: لە توانایاندا نیيە بیکەن، بۆ هەر نوێژێك دەست نوێژێك و لە مابەینیشیان قورئانی دەخوێند).

---

(1) الأسماء والصفات للبيهقي (182) وفي سنده ضعف.

(2) رواه عبدالرزاق في مصنفه (5988)، وابن أبي شيبة (10/531)، والطبراني في الكبير (8696)، وفي الكنز (1/226)، وقال ابن حجر: إسناده صحيح (فتح الباري 9/78).

(3) أخرجه ابن سعد في الطبقات (4/170).

(وكان عروة يقرأ ربع القرآن كل يوم نظراً في المصحف ويقوم به الليل، فما تركه إلا ليلة قطعت رجله ثم عاود من الليلة المقبلة)[1].

واته:(عوروەی کوری زوبەیر خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ هەموو ڕۆژێك چارەکێکی قورئانی دەخوێند، وە شەو لە شەونوێژدا دووبارەی دەکردەوە. بەردەوام ئەم کارەی ئەنجام دەدا تەنها ئەو شەوە نەبێ کە قاچی بڕاوە ئینجا شەوی دوایی دەستی پێ کردەوە).

لە ئیمامی ئەحمەدەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە چەندان جار لە خەودا بە خزمەت خوا گەیشتووە و قسەی لەگەڵ دا کردووە، جارێکیان دەڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر ئەمجارە لە خەودا بیبینم پێی دەڵێم کە چ کارێك باشە تاوەکو بەندە بە هۆیەوە لە خوای خۆی بە نزیکتر بکەوێ. ئەوەبوو کاتێك خوای گەورەی لە خەودا بینی پرسیارەکەی ئاراستە کرد. خوای گەورەش فەرمووی: ئەی ئەحمەد! بە خوێندن و موتالا کردنی قورئان کە فەرمووده و کەلامی خۆمە.

ئیمامی ئەحمەد گوتی: خودایە تێی بگا و تێی نەگا؟

فەرمووی: بەڵێ لە واتاکەی تێ بگا یان نا.

قال عبدالله:(رأيت أبي إذا أختفى أكثر ذلك يقرأ القرآن)

واته: (عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێ: ئەگەر باوکم لەبەر چاوان بزر بوایە ئەوا زۆربەی جار قورئانی دەخوێند).

---

(1) صفة الصفوة لابن الجوزي (2/62).

(2) الآداب الشرعية والمنح المرعية لابن قدامة (2/30).

**پرسیار: ئایا فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی قورئانی مەزن زیاترە یان زیکری (سبحان الله) و (لا إله الا الله) و باقی زیکرەکانی تر؟**

وەڵام: زانایانی باوەڕ پێکراو وەکو نەوەوی لێیان دەگێڕێتەوە[1]، دەڵێن: (واعلم أن المذهب الصحيح المختار الذي عليه من يعتمد من العلماء إن قراءة القرآن أفضل من التسبيح والتهليل وغيرهما من الأذكار. وقد تظاهرت الأدلة على ذلك، والله أعلم).

واتە:( خوێندنەوەی قورئانی مەزن لە زیکری (سبحان الله)و (لا إله إلا الله)و باقی زیکرەکانی تر گەورە ترەو فەزڵ و پاداشتی زیاترە ، بێگومان بۆ پاڵپشتی ئەمەش چەندان بەڵگەی دیارو ئاشکرا هەن ).

کاک فرهاد برادۆستی دەڵێ:

ئـەوانـەی کەوا قورئـان دەخـوێـنن
خێرو پاداشتی زۆر وەدەسـت دێـنن
خۆزگەم بـەو کەسەی لـە قورئـان فێرە
خوێندنەوەی پیتێك ڕاست بە (10) خێرە

داوا لە خوای گەورە دەکەم دڵمان ئاوەدان بکاو ڕوومان بە ڕووی خۆی شاد بکاو لە تام و چێژو زۆر خوێندنەوەی قورئانی مەزن بێبەشمان نەکات.

---

(1) التبيان في آداب حملة القرآن للنووي (ص 21).

# بەشی چوارەم

## ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی مەزن

**لەم بەشەدا:**

1. دڵسۆزی و ئامادەکردنی نیەتێکی ساغ و ساف بۆ خوا
2. رێزگرتن و بە مەزن سەیرکردنی قورئان
3. بەتاڵ وخاڵی کردنی دڵو دەروون و بیروهۆش لە سەرقاڵی و هەرکارێکی دونیا
4. پاککردنەوەی کەرستە و پێداویستیەکان
5. پاك و خاوێنی لەش
6. هەڵبژاردنی کاتێکی گونجاو
7. هەڵبژاردنی شوێنێکی گونجاو
8. هەڵبژاردنی شێوە دانیشتنێکی شایستەوە رێك و پێك
9. ئەو کاتانەی پەسەند نیە قورئان بە دەنگ بخوێندرێ
10. مرۆڤی کافر نابێ لە بیستنی قورئان قەدەغە بکرێ
11. چاك خوێندنەودی قورئان
12. خۆ بە خوا پەناگرتن
13. بە ناوی خوا دەست پێ کردن
14. هێدی هێدی خوێندنەوەی قورئانی مەزن
15. دەنگ خۆشی لە قورئان خوێندن
16. ئایەتەکان و ووشەکانی قورئان؛ قورئان خوێن دەدوێنێ
17. رامان و ووردبوونەوە لە ئایەتەکانی قورئان
18. کەوتنە ژێر کاریگەری ئایەتەکانی قورئانی مەزن
19. گریان و فرمێسك رژاندن لەکاتی قورئان خوێندن
20. حوکمی گوتنی (صدق الله العظیم) چی یە؟
21. قورئان خوێن دەبێ خەتمی بەردەوامی هەبێ ونابێ هیجرەت لە قورئان بکات

ئاداب یاخود ئەدەب: بریتییە لە جۆرە هەڵس و کەوتێکی تایبەت بەرامبەر یەکێك: کەسێك. وە یان هەر شتێکی تر، کەواتە مەبەستمان لە ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئان ئەوەیە کە ئێمە بەرامبەر قورئانی مەزن بەر لە خوێندنەوی یان لە کاتی خوێندنەوەی هەڵس و کەوتێکی تایبەت و ڕەچاوی چەند ڕەوشتێکی چاك بکەین و پێیەوە پابەند بین و جیای بکەینەوە لە هەر کتێبێکی تر، ئەمەش لەبەرئەوەی قورئانی بەرز کەلام و فەرموودەی خوایە، خوای گەورەش شایەنی ڕێزێکی جیایە لە هەر یەکێکی تر، وەك خۆی دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾[1].

واتە:( وەهەر بۆ ئەوە – خوایە – نموونەو سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا. وەهەر ئەوە زاڵی کار دروست).

## ئاداب و ڕەوشتی یەکەم: دڵسۆزی و ئامادەکردنی نیەتێکی ساغ و ساف بۆ خوا:

وەرگرتن و قبول بوونی کردەوەکان لەلای خوای گەورە بە گشتی دوو(2) مەرجی پێویستە، ئەوانیش:

مەرجی یەکەم: ئیخلاص.

مەرجی دووەم: بەڕێوەچوونی کارەکە بەپێی سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

جا ئێمە مەرجی یەکەم زیاتر باس دەکەین:

(عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ فَقَالَ لَهُ نَاتِلُ أَهْلِ الشَّامِ أَيُّهَا الشَّيْخُ حَدِّثْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ نَعَمْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ « إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى

(1) سورة الروم: (27).

يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فعرفها قال فما عملت فيها قَالَ قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ. قَالَ كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَال جَرِيءٌ. فَقَدْ قِيلَ. ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَال فما عملت فيها قَال تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ. قَالَ كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَال عَالِمٌ. وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ. فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا قَالَ مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ قَالَ كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَال هُوَ جَوَادٌ. فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ » )[1].

ورواه بلفظ آخر –وفيه قصة معاوية– الترمذي (2382) وحسنه، وصححه ابن حبان (408) أن مُعَاوِيَةَ دَخَلَ عَلَيْهِ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ بِهَذَا عن أبى هُرَيْرَة فَقَالَ مُعَاوِيَةُ قَدْ فُعِلَ بِهَؤُلاَءِ هَذَا فَكَيْفَ بِمَنْ بَقِيَ مِنَ النَّاسِ ثُمَّ بكى مُعَاوِيَةُ بُكَاءً شَدِيدًا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ هَالِكٌ وَقُلْنَا قَدْ جَاءَنَا هَذَا الرَّجُلُ بِشَرٍّ ثُمَّ أَفَاقَ مُعَاوِيَةُ وَمَسَحَ عَنْ وَجْهِهِ وَقَالَ صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[2].

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: خەڵکی دەوری ئەبو هورەیرەیان چۆڵ کرد، ناتل ناوێکی خەڵکی شام پێی گوت: ئەی مامۆستا. شتێکمان بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەرت بیستبێت، ئەویش گوتی: بەڵێ. لە پێغەمبەرم بیستوە فەرموویەتی: (( یەکەمین کەسێ دادگایی دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا پیاوێکە شەهید بووە، دەهێنرێت و خوای گەورەش ناز و نیعمەتەکانی خۆی

(1) رواه مسلم (1905)، وأحمد (2/322)، والنسائي (6/23) بهذا اللفظ.

(2) سورة هود: (15-16).

پێ دەناسێنێ و ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەفەرموێ: دەی باشە چیت تێدا کردووە؟ ئەویش دەڵێ: جەنگم کردووە لە پێناو تۆدا تاوەکو شەهید بووم.

دەفەرموێ: درۆ دەکەیت، بەڵکو تۆ بۆ ئەوە جەنگت کردووە پێت بڵێن ئازایە، ئەوەشت پێ گوترا، ئینجا فەرمانی پێ دەدرێ دەمەوڕوو کێش دەکرێ تا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.

هەروەها پیاوێکیش فێرە جۆرە زاستێك بووە و خەڵکیشی فێرکردووە و قورئانی خوێندووە، ئەویش دەهێنرێت و باسی ناز و نیعمەتی خۆیی بۆ دەکات و پێی دەناسێنێ.. ئەویش دانی پێدا دەنێت. دەفەرموێت: دەی باشە چیت تێدا کردووە؟

ئەویش دەڵێ: فێری زانست بووم خەڵکیشم فێرکردووە[1] و لەبەرخاتری تۆش قورئانم خوێندووە. دەفەرموێ: درۆت کرد بەڵکو بۆ ئەوە فێری بویت تا پێت بڵێن زانایە، قورئانیشت خوێندووە تا پێت بڵێن قورئان خوێنە، ئەوەشت -لە دونیادا- پێ گوترا، پاشان فەرمان دەدات دەمەوڕوو کێش دەکرێت، تا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.

پیاوێکیش خوا دەرووی خێری لێ کردۆتەوە و لە هەموو جۆرە ماڵێکی پێ بەخشیوە، دەهێنرێت و ناز و نیعمەتی خۆی پێ دەناسێنێ و ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەفەرموێ: باشە چیت پێ کردووە؟

---

(1) لەکاتی نووسینەوەی ئەم بابەتە.. وە لەم بڕگەیەدا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کە لەلام دانیشتبوو باسم لەوەکرد: کە بەڕاستی زۆر ناخۆشە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە لەبەردەم ئەم هەموو خەڵکەدا پێت بڵێ: درۆت کرد، پێم گوت: گریمان ئەو کەسە من بم و خوای گەورە بفەرموێ: ناز و نیعمەت و زانستم پێبەخشی، تۆ چیت تێدا کرد؟ منیش بڵێم: خوایە کتێبێکم لەبارەی کەلام و فەرموودەکەی تۆ نووسی و بڵاوم کردەوە و زیاتر خەڵکیم پێی ئاشنا کرد و زۆر پێیەوە ماندوو بووم.

خوای گەورەش بفەرموێ: (درۆت کرد). ئینجا دەمەو ڕوو بۆ ناو ئاگر ڕام کێشن.

هاوسەرەکەشم گوتی: خوا نەکا.

منیش گوتم: انشا الله هەموو هەوڵێك دەخەمەکار بۆ ئەوەی ئەم نووسینە بە دڵسۆزی بۆ خوا بێ.

ئەویش دەڵێ: هیچ ڕێگەیەکم نەهێشتۆتەوە کە تۆ پێت خۆش بێت ماڵی تێدا بەخت بکرێت و نەم گرتبێتە بەر لە پێناوی تۆدا.

ئەویش دەفەرموێ: درۆ دەکەیت. بەڵکو تۆ بۆیە وات کردووە تا پێت بڵێن: کەسێکی بەخشندە و ناندەرە. ئەوەشت پێ گوترا. پاشان فەرمان دەکرێت دەمەوڕوو کێش دەکرێت ئینجا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە )).

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: "المسر بالقران كالمسر بالصدقة، والجاهر بالقرآن كالجاهر بالصدقة"[1].

واتە: "خوێندنی قورئان بە نهێنی وەکو بەخشینی خێر و خێرات وایە بە نهێنی. وە خوێندنی قورئان بە ئاشکرا وەکو بەخشینی خێر و خێرات وایە بە ئاشکرا".

کەواتە: ئەگەر قورئانی بە ئاشکرا خوێند ئەوە کارێکی باشە، بەڵام بە نهێنی زۆر باشترە بۆی. ئەمەش وەکو ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەربارەی (صدقة) دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ﴾[2] واتە: ((ئەگەر خێر و چاکە و بەخشینەکانتان بە ئاشکرا ئەنجام بدەن ئەوە شتێکی چاکە. خۆ ئەگەر بیشارنەوە و بە نهێنی بیدەن بە هەژاران ئەوە چاکترە بۆتان. جا -بەو بەخشینە- خوا هێندێک لە گوناهەکانتان دەسڕێتەوە. وە خوا شارەزا و ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)).

---

(1) رواه أحمد (17128)، والطبراني في الكبير (4336)، وفي الاوسط (3363)، وابو يعلى في مسنده (1697)، والبخاري في خلق افعال العباد (254)، والالباني في صحيح الجامع (3105).

(2) سورة البقرة: (271).

عن الاعمش قال: كنت عند ابراهيم النخعي وهو يقرأ في المصحف واستأذن عليه رجل، فغطّى المصحف وقال: (لا يرى هذا أنني اقرأ فيه كل ساعة)[1].

واتە: لە ئەعمەشەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: لەلای ئیبراهیمی نەخەعی بووم لەو كاتەی قورئانی دەخوێند پیاوێك ماوەی خواست بێتە لای. ئەویش قورئانەكەی داپۆشت و گوتی: "با وا نەبینێ من هەموو كاتێك قورئان دەخوێنم".

خواناسێك دەڵێ: "شەوێكیان لەكاتی بەرەبەیان لە ژوورەكەمدا -كە بەسەر ڕێگاكەی بەردەم ماڵمان دەیڕوانی- سوورەتی (طه)م دەخوێند.. دوای كۆتایی هاتنی سوورەتەكە كەمێك بۆرژام.. لە خەونمدا كەسێكم بینی وا لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە لام.. پەڕاوێكی بەدەستەوە بوو ولەبەردەممدا كردییەوە.. كە تەماشام كرد سوورەتی (طه)یە.. وە لەژێر هەر پیتێكدا دە (10) چاكە تۆمار كرابوو جگە لە ووشەیەكیان نەبێ كە هیچی لەژێر نەنووسرابوو.

منیش گوتم: سوێند بە خوا ئەم ووشەیەشم خوێندۆتەوە كە چی نابینم پاداشتەكەی نووسرابێت!

كەسەكە گوتی: ڕاست دەڵێی، ئێمەش نووسیمان، بەڵام لە لایەن عەرشەوە [2] بانگ كراین و پێمان گوترا: پاداشتەكەی بسڕنەوەو لایبەرن، ئیدی سڕیمانەوە.

دەڵێ: لەخەونەكەمدا گریام و گوتم: لەبەرچی؟

---

(1) صفة الصفوة لابن الجوزي (55/3).

(2) مەبەست لە خوای گەورەیە كە بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرش، بەرزبوونەوەیەك كە لایەقە بە خۆی و ئێمە چۆنیەتەكەی نازانین.

کەسەکە گوتی: لەو کاتەدا پیاوێك بەلاتدا تێپەڕی و تۆش لە پێناوی ئەودا لەم ووشەیە دەنگت بەرز کردەوە، بۆیە پاداشتەکەی ڕۆیشت[1].

دەگێڕنەوە:(جارێکیان پیاوێك نوێژێکی زۆر جوانی دەکرد، گوتیان: بەڕاستی نوێژێکی زۆر جوان و ڕێکوپێك دەکا، ئیدی هەر لە نوێژەکە ئاوڕێکی دایەوەو گوتی: وەڵڵا دەنا بە ڕۆژووشم).

تێبینی:خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئانی بەڕێز یەکێکە لەو بەندایەتییانەی کە بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێن، جا ئەگەر قورئان خوێن زانی بەهۆی خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئان بەئاشکرا خەڵکانێك هاندەدا بۆ ڕووکردنە قورئان ئەوا -إنشاء الله- ئەمەش یەکێکە لە کارە چاکەکان، بەهەرحاڵ بەئاشکرا یان بە نهێنی دەبێ ئەو کەسە ووریا بێ و نەهێڵێ دووچاری نەخۆشی ڕیایی و عوجب ببێ.

## ئاداب و ڕەوشتی دووەم: ڕێزگرتن و بە مەزن سەیرکردنی قورئان:

زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە دەبێ قورئانی مەزن بە گەورە سەیر بکرێ و زۆر ڕێزی لێ بگیرێ و بە پاك و خاوێن و بێ لەکە و خەوش دابنرێ. وە یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك پیتێکی لێ زیاد یان کەم بکات، یان گومانی تێدا هەبێت و بڕوای پێ نەبێت و نکوڵی لێ بکات، وە زانا و ئاگاداریش بێ بەمە ئەوە کافرە.

قازی عەیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (بزانە ! هەر کەسێك قورئانی بەڕێز یان هێندێکی بە سووك سەیر بکا و بە کەمی بزانێ، یان جوێن و قسەی ناشیرین و بێجێی پێ بدا و لەعنەت و نەفرینی لێ بکا، یان نکوڵی لە پیتێکی بکا، یان کارێك بە درۆ بزانێ کە بەڕاشکاوی و بێ پەردە لەبارەی حوکمێك یان هەواڵێك باسی کردووە، یان کارێکی بۆ دابنێ نەرێی کردبێ

(1) تنوير الاذهان من تفسير روح البيان للبروسوي (2: 27).

یان نەرێی کارێك بکا دانی پیا دانابێ وە بەمەش زانا بێت، یان گومانی لە یەکێك لەمانەدا هەبێت کە باسمان کرد ئەوە بە یەك دەنگی مسوڵمانان ئەو کەسە کافرە..)[1].

ئیبن عەبدول قەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبەکەیدا (مجمع البحرين) دەڵێ: (إنه يحرم الاتكاء على المصحف وعلى كتب الحديث وما فيه شيء من القرآن اتفاقاَ)[2].

واتە: ( بێگومان بە یەك دەنگی زانایان حەرامە و قەدەغە کراوە مرۆڤ بەسەر قورئان، یان کتێبەکانی فەرموودە یاخود کتێبێك کە شتێکی لە قورئان تێدابێ پاڵ بکەوێ). واتە: بیکا بە سەرینی خۆی و ئانیشکی بە سەردا بدا.

**ئاداب و ڕەوشتی سێیەم: بەتاڵ و خاڵی کردنی دڵ و دەروون و بیروهۆش لە سەرقاڵی و هەر کارێکی دونیا:**

پێش ڕووکردنە خوێندنەوەی قورئان پێویستە هەستین بە جێبەجێ کردنی پێویستییەکان و بەدوا داچوونی داواکاریەکانی دەروون و جەستە، چونکە ئەم پێویستی و داواکاریانە زۆری لە نەفس و دەروون و جەستە دەکەن و لە دڵدا دەمێننەوە و دەبنە پەرچ لە ڕێی تێگەیشتن و ووردبوونەوە لە قورئان. وە با خوێنەری قورئان هەوڵبدا – لە کاتی خوێندنەوەدا- برسی و تێنوو نەبێ، یان غەمبارو پەژارەو لە دڵە ڕاوکێدا نەبێ، چونکە دەبێتە هۆی بێزاری لە خوێندنەوەدا، یان لە شوێنێکی زۆر سارد یان گەرمێکی هەراسانکەر، یان لە شوێنێکی گشتی و سەرەڕێ، یان دانیشتن بەرامبەر تەلەفزیۆن کە بە ڕواڵەت چاوی لە قورئانە کەچی لە ڕاستیدا گوێی لە تەلەفزیۆنە، وە یاخود هەر هۆکارێکی تر کە ببێتە سەرقاڵی.



---

(1) التبيان في آداب حملة القران للنووي (ص165).

(2) الاداب الشرعية والمنح المرعية لابن قدامة المقدسي (2/275).

**ئاداب و ڕەوشتی چوارەم: پاك کردنەوەی کەرستەو پێداویستی یەکان:**

پاککردنەوەی ئەو کەرستە و پێداویستی‌یانەی کە بەهۆیانەوە یان لە ڕێیانەوە هەڵس‌و کەوت لەگەڵ قورئانی مەزن دەکەین لە ژەنگ‌و ژاری تاوان‌و ئەو سەرپێچی‌یانەی پێیانەوە لکاوە کارێکی پێویستە، چونکە خوێندنەوەی قورئان بە چاوێك چۆن چاك دەبێ و تێگەیشتن لەڕێیەوە دەبێت کە چەندەها سەیرکردنی حەرام و کاری پیس و بۆگەنی پێ کردووە؟! یان گوێ‌یەك کە چەندەها دەنگی گڵاو و قسەی بەد و خراپی پێ بیستووە؟! یان بە زار و زمانێك کە پیشەی سەرەکی بریتی بووە لە قسەی پاش ملە و بوهتان و درۆ و سیخوڕی و قسەی نابەجێ؟! یاخود- لە هەموویان گەورەتر- بە دڵێك داپۆشراوەو دەورە دراوەو داخراوە بە گومان‌و ئارەزووەکان؟! دڵێکی بەد بەخت و چارەڕەش کە جۆرەها نەخۆشی وەکو ئارەزوو بازی و گومان و بەرچاوی و لەخۆبایی و خۆ بە زل زانی تێدابێت؟!

کەواتە: پاك کردنەوەی هەموو ئەو شوێنانەی باس کران، وە یان ئەو کەرستە و پێداویستی‌یانەی پەیوەندیان هەیەو باس نەکراون، مەرجن بۆ سوود وەرگرتن لە قورئان و گەیشتن بە ئامانج.

**ئاداب و ڕەوشتی پێنجەم: پاك و خاوێنی لەش:**

پاك‌و خاوێنی لەش لە هەموو ئەو پیسی‌یانەی قەدەغەکراون لە کاتی خوێندنەوەو دەست لێدانی قورئان پێویستە، وەنابێ پیاو لەو کاتەدا لە (جەنابەت‌و لەش گرانی) دابێ، وەئافرەتیش لە (جەنابەت‌و حەیزو زەیستانی)* دابێ.

* هەندێك لە زانایانی ئوممەت - لەبەرئەوەی ئایەتی: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ لای ئەوان تەفسیرەکەی (لوح المحفوظ) دەگرێتەوەو ئەو فەرموودانەی قەدەغەی قورئان خوێندن دەکەن لەم حاڵەتانەدا بێ‌هێز(ضعیف)ن - ڕێگەیان داوە لە هەندێك کاتی پێویست قورئان بخوێندرێ و دەستی لێ

وەکەسێك لەم حاڵەتانەی لە سەرەوە باس کراون خاوێنە بەڵام دەست نوێژی نیە ئەوا بۆی هەیە قورئان بخوێنێ و هیچ پەرچ و لەمپەرێك لە ئارادا نیە. هەرچەندە هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە کاتێك ئافرەت لە حاڵەتی حەیزو زەیستانی دایە قورئان بخوێنێ، بەتایبەتی ئەوانەی خەریکی لەبەرکردن و پێداچوونەوەی قورئانن.

نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( ویستحب ان یقرأ القرآن وهو علی الطهارة، فان قرأ محدثا جاز بأجماع المسلمین، والاحادیث فیه کثیرة معروفة، قال امام الحرمین: ولا یقال ارتکب مکروها، بل هو تارك للافضل)[1].

واتە:( وا بە باش دەزانرێ کە قورئان لە کاتی هەبوونی دەست نوێژدا بخوێنرێ، بەڵام ئەگەر بێ دەست نوێژ -بەبێ دەست لێدان- خوێندنییەوە جائیزە بەڕای تێکڕای زانایانی مسوڵمان، وە چەندان فەرموودەی ئاشکرا و دیار لەم بارەیەوە هەن، ئیمامی حەرەمەین دەڵێ: ئەو کەسەی بێ دەست نوێژ قورئان دەخوێنێ ناگوترێ کارێکی ناپەسەندی کردووە، بەڵکو ئەو تەنها کارێکی چاکی کردووە نەوەکو چاکتر).

---

بدرێ. جا بۆ زیاتر زانیاریو بەرچاوڕوونیو بەڵگەی ئەوانەی ڕێگەیان داوەو ئەوانەی بە جائیزی نازانن بڕوانە:

1- صحیح فقه السنة وادلته وتوضیح مذاهب الائمة لابو مالك کمال بن السید سالم (1/ 147/144).

2- مجموع الفتاوی الکبری لابن تیمیة (152/21، 259).

3- فضائل القرآن لأبي عُبَيد القاسم ابن سلام الهَرَوي (ص400).

4- فضائل القرآن لأبي عباس بن جعفر المستغفري (ص 212-222).

(1) التبیان في آداب حملة القرآن للنووي (ص70) .

وأورد الامام المالك في الموطأ قول محمد بن سيرين رحمه الله أن عمر بن الخطاب رضى الله عنه كان في قوم يقرأون القرآن، فذهب لحاجته، ثم رجع وهو يقرأ القرآن، فقال رجل: ياأميرالمؤمنين، أتقرأ القرآن ولست على وضوء؟

فقال له عمر: (من أفتاك بهذا ؟! أمسيلمة ؟!)[1].

واتە: ( لە موحەممەدی کوڕی سیرین ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ لەگەڵ کۆمەڵێك دا قوڕئانیان دەخوێند، ئیدی عومەر بۆ پێویستی چووە سەر ئاو، ئینجا کە گەڕایەوە لەو کاتەدا قوڕئانی دەخوێند پیاوێکیش -کە ئییاسی کوڕی صوبەیحە و لە هۆزی موسەیلەمەی درۆزن بوو- گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! ئایا بەبێ هەبوونی دەست نوێژ قوڕئان دەخوێنی؟

عومەریش پێی گوت: کێ ئەم فەتوایەی بۆ داوی؟ ئایا موسەیلەمە؟!).

**ئاداب و ڕەوشتی شەشەم: هەڵبژاردنی کاتێکی گونجاو:**

هەموو کارێك ئان و کات و ساتی خۆی هەیە، دیارە خوێندنەوەی قوڕئانیش یەکێکە لەو کارانەی وا چاکترە لە کات و ساتێکی لەبار و گونجاوتر ئەنجام بدرێ. مەبەستمان لە کات و ساتی گونجاوتر ئەو کات و ساتانەیە کە پەروەردگار زیاتر لێ خۆش بوون و بەزەیی خۆی دەنێرێ.

جا بزانە چاکترین و باشترین کاتی قوڕئان خوێندن ئەوەیە لە نوێژدا بێ، مەزهەبی شافعیو غەیری ئەویش درێژکردنەوەی ڕاوەستان لە نوێژدا بەهۆی قوڕئان بە چاکترو باشتر دەزانن لە درێژکردنەوەی سوژدە، بەڵام خوێندنەوەی قوڕئان لە غەیری نوێژدا لە نیوەی شەو یان سێیەکی کۆتاییەکەی چاکترە لە سەرەتایەکەی. ئینجا بەرەبەیانێکی زۆر زوو (الفجر) پاشان بەیانیان (الصبح)، ئینجا باقی کاتەکانی تر لە ڕۆژدا.

---

(1) موطأ مالك، باب الرخصة في قراءة القرآن على غير وضوء (420)، وفي مصنف ابن ابي شيبة مختصرا (1 127)، ومصنف عبدالرزاق (1318).

وەلە مانگ و ڕۆژەکانیشدا مانگی ڕەمەزان بە گشتیو دە (10) شەوو ڕۆژی کۆتایی‌یەکەی بە تایبەتی.

## ئاداب و ڕەوشتی حەوتەم: هەڵبژارنی شوێنێکی گونجاو:

هەڵبژاردنی شوێنێکی لەبار و گونجاو و پاك و خاوێن و دوور لە هەموو کارو ژاوەژاو و غەڵبە غەڵب و هات و هاوارو قسە و گەمەو گاڵتەو یاری‌یەکی مندالان بۆ خوێندنەوەی قورئان پێویستە، هەر چەندە لە شوێنی قەرەباڵغ و یاری مندالان و ژاوەژاو و لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل و هەر شوێنێکی تر بە مەرجێك پاك و خاوێن بێ جائیزە و ڕێگەی پێدراوە، ئەگەر چی لەم حاڵەتەدا ڕامان و تێگەیشتن لە قورئان کەمتر دەبێ، وە نابێ و جائیز نی‌یە لە شوێنێك قورئان بە دەنگ بخوێندرێ خەڵك نەتوانێ یاخود نەیەوێ گوێی بۆ بگرێ، چونکە ئەمە شایەن نی‌یە بە قورئانی بەرێز و نزیکە لەوەی سوکایەتی پێ بکرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾[1].

واتە:((وەکاتێك کە قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرن و بێ دەنگیش بن بۆ ئەوەی میهرەبانیتان لەگەڵ دا بکات)).

وەبە هیچ جۆرێك خوێندنەوەی قورئان لە هەر یەکە لە ئاودەست و شوێنی میز کردن و پیسایی جائیز نی‌یەو دەبێتە سوکایەتی کردن بە قورئانی مەزن.



---

(1) سورة الاعراف: (204).

## ئاداب و ڕەوشتی هەشتەم: هەڵبژاردنی شێوە دانیشتنێكی شایستە و ڕێك و پێك:

هەڵبژاردنی دانیشتنێكی تایبەت و ڕێك و پێك و مل كەچی بۆ خوا پێوە دیار بوون یەكێكە لە ڕەوشتە زۆر جوانەكان، چونكە ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێ لەو كاتەدا لە خواپەرستی دایەو خوای گەورە قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا دەكات.

وەچاكترین جۆری دانیشتن كە لەوپەڕی جوانی و تەواوی دایە لە شێوەی تەحیات دانیشتنە وەكو بۆ نوێژ، وە ئەگەر لەم جۆرە دانیشتنە ماندوو بوو، یاخود ئارەزووی نەكرد ئەوا بۆی هەیە و جائیزە بە هەر شێوەیەك دابنیشێ با ڕووە و قیبلەش نەبێ. هەروەها بۆی هەیە و دەتوانێ و ئاسایی‌یە بە ڕاوەستان، یان پاڵ كەوتن، یان لەناو جێگای نوستن، وە یان بە هەر شێوەیەكی تری لایەق و گونجاو قورئان بخوێنێ و پاداشتی هەیە، ئەم دەقانەی خوارەوەش چەند بەڵگەیەكن لە قورئان و سوننەت لەسەر چۆنیەتی هەڵس و كەوت و دانیشتنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هێندێك لە هاوەڵە بەڕێزەكانی خوا لێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بكات بەرامبەر قورئان خوێندن و یادكردنی خوا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) ﴾[1].

واتە: (بە ڕاستی لە دروست كردنی ئاسمانەكان و زەویدا و لە جیاوازی و گۆڕانی شەووڕۆژ دا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ هۆشمەند و خاوەن ژیرەكان، ئەوانەی یادی خوا دەكەن بە پێوەو بە دانیشتن و بە ڕاكشان، وە بیردەكەنەوە

---

(1) سورة ال عمران: (191،190).

لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەمەت بە بێ هودە و بە بێ ئامانج دروست نەکردوە، پاك و بێگەردی بۆ تۆ، وە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ).

(حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أُمِّهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ)[1].

واتە: (لە عائشەی دایکمانەوە خوا لێ ی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەری دەکردە سەر کۆشم و منیش لەو کاتە لە حەیز دابووم، ئینجا قورئانی دەخوێند).

لە عائشەوە ڕەزای خوای لە سەر بێت دەڵێ: ( إني لأقرأ حزبي أو عامة حزبي وأنا مضطجعة على فراشي)[2].

واتە: (بەڕاستی من هەندێك جار لە پشکی ڕۆژانەم دەخوێنم لەو کاتەدا لە سەر جێگەکەم پاڵ کەوتوم).

**تێبینی:**

دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە جیاوازی هەیە لە نێوان کۆڕو مەجلیسی فەرموودە وەرگرتن و فێربوونی زانست و زانیارییەکانی قورئان و سوننەت کە لەبەر حاڵەت و بارە کۆمەڵایەتیەکەی پێویست بەوە دەکات ڕەوشت و ئادابی ڕێك و جوان دانیشتنی تێدا ڕەچاو بکرێ وەلە نێوان کارو پەرستشی تایبەتیو شەخسی کە بوارو مەودای زیاتری هەیە لەبەر داواکرانی بەبەردەوامی و زووزوو بەجێ گەیاندنی، وەکو ئەم نمونەیە:(عن سعيد بن

---

(1) رواه البخاري (7549)، ومسلم (301)، وأبو داود (260)، والنسائي (1/191)، وابن ماجة (634)، وأحمد (6/96).

(2) مصنف ابن ابي شيبة (2/384)، وعبدالرزاق(1/340)، والفريابي(154).

المسيب رحمه الله أنه سئل عن حديث وهو متكيء، فاستوى جالساً وقال: أكره أن أحدث عن رسول الله -صلى الله عليه وسلم- وأنا متكيء)[1].

واتە: (لە سەعیدی کوڕی موسەییب ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە دەربارەی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری لێکرا و لەو کاتەدا شانی دادابوو یەکسەر ڕاست بووەوە و دانیشت، گوتی: بە پەسەندی نازانم دەربارەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قسە بکەم و شانیشم دادابێ و پاڵ کەوتبم).

**ئاداب و ڕەوشتی نۆیەم: ئەو کاتانەی پەسند نی یە قورئان بە دەنگ بخوێنرێ:**

بابای قورئان خوێن لە کاتی قورئان خوێندندا پێویستە دەنگ بەرز نەکاتەوە بەسەر کەسانی تردا ئەگەر ئەو کەسانە خەریکی کاری تایبەتین وەکو نوێژ و قورئان خوێندن. وە با لە یەکتری تێك نەدەن و بەوە بەرابەرکێ دروست نەبێ.

بەڵێ: لە ڕەوشت جوانی قورئان خوێنە بە قورئانەکەی دەنگ بەرز نەکاتەوە لەلای نوێژ خوێنێك[2]. یان نووستوێك[3]. یاخود قورئان خوێنێکی ترو ببێتە هۆی ئازار پێ گەیاندنیان.

---

(1) الاداب الشرعية والمنح المرعية لابن مفلح المقدسي الحنبلي (2 400).

(2) وەکو لە پێش وەتاری هەینی بۆ ماوەیەك بە دەنگەوە (مایکرۆفۆن)ێك قورئان دەخوێندرێ کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی یەو کارێکی زیادەیە. وە لەم کاتەدا خەڵکان لە کاتی هاتنیان بۆ مزگەوت نوێژی (تحية المسجد) دەکەن و هی وا هەیە لێی تێك دەچێ و سازاری پێ دەکات. وەهی واهەیە خەریکی خوێندنەوەی قورئان و زیکر و سەڵەوات لێدانە.

(3) وەکو لە سێیەکی کۆتایی شەو لە مزگەوتەکان - بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزان- قورئان دەخوێنرێو کەبار دەکرێ کە چەندەها جار بیستومانە منداڵی ساوا لە خەو ڕادە، ترساوە.

(عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم اعْتَكَفَ وَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: « أَمَا إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ فَلْيَعْلَمْ أَحَدُكُمْ مَا يُنَاجِي رَبَّهُ وَلاَ يَجْهَرْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ بِالْقِرَاءَةِ فِي الصَّلاَةِ)[1].

واتە:(لە عبداللەی کوڕی عمر ڕەزای خوایان لەسەر بێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئیعتیکافی کرد و ووتاری بۆ خەڵك خوێندەوە و فەرمووی: ((گەر یەکێك لە ئێوە نوێژی ئەنجامدا ئەوا با چاك بزانێت لەگەڵ خوای خۆی قسە دەکا، کەواتە کەس لە ئێوە لە خوێندنەوەی قورئاندا دەنگی خۆی بەسەر ئەویتر بەرز نەکاتەوە لە نوێژدا)).

جا ئەگەر لە نوێژدا-جگە لە ئیمام- دەنگ بەرزکردنەوە بە قورئان قەدەغە کرابێ بۆ ئەوەی ئازار بە مسوڵمانانی تر نەگات ئەوا لە حاڵەتەکانیتر زیاتر.

**ئاداب و ڕەوشتی دەیەم: مرۆڤی کافر نابێ لە بیستنی قورئان قەدەغە بکرێ:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾﴾[2].

واتە:(وە ئەگەر کەسێك لە هاوبەش پەیداکارەکان داوای هاوسێیەتی و پەنادانی لێت کرد ئەوە پەنای بدە، هەتا قسەی خوا ببیستێ لە پاشان بیگەیەنە جێگای هێمنی خۆی...).

بەڵام قەدەغەی دەست لێدانی قورئانی مەزنی لێ دەکرێو نادرێتە دەستی.



(1) رواه أحمد (36/2، 6، 129)، وابن أبي شيبة (488/2)، وابن خزيمة (2237)، والطبراني (13527) بسند صحيح.

(2) سورة التوبة: (6).

**ئاداب و ڕەوشتی یانزەهەم: چاك خوێندنەوەی قورئان:**

قورئان خوێن دەبێ بایەخێکی چاك بدات بە تەجوید و چاك خوێندنەوەی قورئان تا هەموو پیتێك بە ڕاست و ڕەوانی بڵێ و پاداشتی تەواوی دەست بکەوێ.

**ئاداب و ڕەوشتی دوانزەهەم: خۆ بە خوا پەنا گرتن:**

لە سەرەتادا پێش ئەوەی دەست بکەین بە خوێندنەوەی قورئانی بەڕێز وا باشە خۆمان بە خوای گەورە پەنا بگرین. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾[1].

واتە: (ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیت ئەوا خۆت بە خوا پەنا بگرە لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو).

ئیبن کثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (هَذَا أَمْر مِنْ اللَّه تَعَالَى لِعِبَادِهِ عَلَى لِسَان نَبِيّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادُوا قِرَاءَة الْقُرْآن أَنْ يَسْتَعِيذُوا بِاَللَّهِ مِنْ الشَّيْطَان الرَّجِيم وهذا أَمْر نَدْب لَيْسَ بِوَاجِبٍ حَكَى الْإِجْمَاع عَلَى ذَلِكَ أَبُو جَعْفَر بْن جَرِير وَغَيْره مِنْ الْأَئِمَّة).

واتە: ((ئەمە فەرمانێکە لە خوای بەرزەوە بۆ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی محمد صلی الله علیه وسلم کە ئەگەر ویستتان قورئان بخوێنن ئەوا خۆیان بە خوا پەنا بگرن لە شەیتانی نەفرەت لێکراو، ئەم فەرمانە سوننەتە نەوەکو واجب، ئەمە بە کۆڕای زانایانی ئیسلام کە ئەبو جەعفەری کوڕی جەریری تەبەری و غەیری ئەویش لە زانایان گێڕاوێتیانەوە)).

---

(1) سورة النحل: (98).

**ئاداب و ڕەوشتی سیانزەهەم: بە ناوی خوا دەست پێ کردن:**

لە كاتی دەست پێ كردن و خوێندنەوەی سەرەتای هەر سوڕەتێك وا چاكە مسوڵمان بڵێ (بسم الله الرحمن الرحيم) ئەمەش بۆ سەرەتای هەموو سوڕەتەكان جگە لە سوڕەتی (التوبة).

**تێبینی:** گوتنی (بسم الله الرحمن الرحيم) بۆ سەرەتای سوڕەتی (الفاتحة) لە هەر ڕكاتێكی نوێژدا واجب و پێویستەو بە نەكردنی نوێژەكە بەتاڵ دەبێت.

**ئاداب و ڕەوشتی چواردەهەم: هێدی هێدی خوێندنەوەی قورئانی بەڕێز:**

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾[1].

واتە:(وە بەكاوەخۆ و هێدی هێدی قورئانی مەزن بخوێنەوە).

خوێندنەوەی قورئانی مەزن بە تەرتیل و لەسەرەخۆ و بە هێواشی كارێكی زۆر چاكە و زانایان كۆكن لەسەر بە باشتر زانینی، بۆ ئەمەش چەند بەڵگەیەك -جگە لەم ئایەتەی كە لە سەرەوە باس كرا- دەهێنینەوە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: « يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِى الدُّنْيَا فَإِنَّ مَنْزِلَتَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَأُ بِهَا»[2].

واتە: لە عبداللەی كوڕی عەمڕەوە خوا لە هەردووكیان ڕازی بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(بە هاوڕێیانی قورئان دەگوترێ: هێدی هێدی بخوێنەوەو بە پلەكانی بەهەشت سەركەوە هەروەكو

---

(1) سورة المزمل: (4).

(2) رواه الترمذي (2915)، وأبو داود (1464)، والنسائي في فضائل (81)، وأحمد في المسند (192/2)، وابن حبان في موارد (1789)، وابن ابي شيبة (498/10)، والبيهقي في سننه (53/2)، وصححه الحاكم (1/552 - 553) ووافقه الذهبي. وفي صحيح الجامع للالباني (7978).

چۆن لە دونیادا بە هێواشیو لەسەرەخۆ دەتخوێندەوە. چونکە بێگومان پلەو پایەی تۆ لەو شوێنەیە کە تۆ کۆتا ئایەت لەبەر دەخوێنی).

((حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ قَالَ سُئِلَ أَنَسٌ كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم. فَقَالَ كَانَتْ مَدًّا. ثُمَّ قرأ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. يَمُدُّ بِبِسْمِ اللَّهِ. وَيَمُدُّ بِالرَّحْمَنِ. وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ))[1].

واتە: قەتادە دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیك پرسیار کرا: خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن بووە؟

گوتی: خوێندنەوەی بە شێوەی مەدد بووە واتە: ئەو شوێنانەی پێویستیان بە درێژکردنەوە دەبوو درێژی دەکردنەوە- نینجا ئەنەس: (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێندەوە، لامی (الله) و ئەلیفی (الرحمن) و یێ (الرحيم)ی درێژ دەکردەوە. واتە: بە قەد مەددی ئاسایی وەکو لە ئەحکامی تەجوید و چاك خوێندنەوەی قورئان ڕوون کراوەتەوە.

(عن أبي جمرة الضبعي رحمه الله قال: قلت لأبن عباس إني سريع القراءة، و إني اقرا القرآن في ثلاث. فقال: لأن أقرأ البقرة في ليلة فأدبرها وارتلها، أحب إلي من أن أقرأ كما تقول)[2].

واتە: ( لە ئەبو جومڕەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: بە عبداللەی کوڕی عەبباسم گوت: بەڕاستی من زۆر خێرام لە خوێندنەوەدا. هەموو قورئانی مەزن لە سێ(3) ڕۆژدا دەخوێنمەوە.

---

(1) رواه البخاري (5045)، واخرجه ايضا في خلق الافعال (296-297).

(2) آبوعبيد في فضائل القرآن (ص74)، واخرجه البخاري في خلق الأفعال (260)، وابن ابي شيبة (2 520)، وابن سعد (6 90)، وابن نصر في قيام الليل (ص121)، والطبراني في الكبير (ج 9 8695)، وابو نعيم في الحلية (2/99) والبيهقي (2/54) وفي الشعب (ج 5/1973)، وابن الأعرابي (ج 3/ق 47 ، 1)، وابن كثير في فضائل القرآن (ص 236) بسند صحيح.

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: گەر سوڕەتی (البقرة) لە شەوێكدا بخوێنمەوە و چاك لێی وورد ببمەوە و هێدی هێدی بیخوێنمەوە لام خۆشترە لەوەی بەو شێوەیەی كە تۆ باسی دەكەی).

**ئاداب و ڕەوشتی پانزەهەم: دەنگ خۆشی لە قورئان خوێندن:**

هەموو جوانی و ڕازاوەیەكی شەرعیانە لە ئیسلام دا پەسندە، چونكە دەبێتە هۆی خۆشی و حەسانەوەی دڵ و دەروون، جا بۆ ئەوەی قورئانی مەزن زۆر خۆشەویست بكرێ و دڵان چاكتر دەرگای بۆ بخەنە سەر پشت و ڕووناكی‌یەكەی باشتر بچێتە ژوورەوە، سوننەتە بە دەنگێكی خۆش بخوێنرێ.

بۆیە ئەگەر بڕوانین و سەرنج بدەینە سیرەو ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەبینین لە سەرەتادا خۆی لە خوێندنەوەی قورئاندا بێ وێنە بوە لە دەنگ خۆشی، وە لە چەندان فەرموودەدا مسوڵمانانیشی بۆ هانداوە:

لە بەڕائی كوڕی عازەبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (زينوا القرآن بأصواتكم)[1].

واتە: (بە دەنگەكانتان قورئان بڕازێننەوە)..

خەطابی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (معناه زينوا أصواتكم بالقرآن)[2].

واتاكەی ئەوەیە: (دەنگەكانتان بە قورئان بڕازێننەوە).

---

(1) رواه البخاري في صحيحه معلقا (518/13) وموصولاً في خلق أفعال العباد (250، 253، 254، 256)، وأبو داود (1468)، والنسائي (179/2–180)، واحمد (283/4، 285، 296، 304)، وابن ماجه (1342) والدارمي (474/2) وابن حبان في الاحسان (65/2)، والحاكم (571/1)، وصحيح الجامع للألباني (3574).

(2) عون المعبود شرح سنن ابي داود (3 /402).

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((لیس منا من لم یتغن بالقرآن))[1].

واتە: (( لە ئێمە نیە ئەو کەسەی قوڕئان بە ئاواز و دەنگێکی خۆش و دڵڕفێن نەخوێنێ و بایەخی پێ نەدات)).وە بە ئەبو مولەیکە گوترا: (یا أبا محمد: أرأیت إن لم یکن حسن الصوت؟ قال: یحسنه ما استطاع)[2].

واتە: (ئەی باوکی موحەممەد: ئەی ئەگەر دەنگی خۆش نەبوو؟
گوتی: دەنگی خۆش دەکات ئەوەندەی بۆی کرا ) .

عَنْ ابن أَبِی هُرَیْرَةَ رضی الله عنه أَنَّهُ کَانَ یَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم: ( لَمْ یَأْذَنِ اللَّهُ لِشَیْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِیِّ صلی الله علیه وسلم یَتَغَنَّی بِالْقُرْآنِ یجهر به )[3]

واتە: لە عبدالرحمانی کوڕی سەخرەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم م بیست دەیفەرموو: (خوا لە هیچ کارێك وا بە چاکی گوێ ناگرێ وەك گوێ دەگرێ لە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش یان لە قورئان خوێنێکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازێکی جوان و خۆش قوڕئان بخوێنێ و بە شەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ).

عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَیْدٍ عَنِ النَّبِیِّ صلی الله علیه وسلم قَالَ: ( لَلَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَشَدُّ أَذَناً لِلرَّجُلِ الْحَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ مِنْ صَاحِبِ الْقَیْنَةِ إِلَی قَیْنَتِهِ)[4].

---

(1) رواه أبوداود في سننه (1469، 1470) بسند صحيح.

(2) السنن البيهقي (2/54).

(3) رواه البخاري (7544) وفي خلق الأفعال (242)، ومسلم (972).

(4) اخرجه احمد (6/19)، والحاكم (1/574) وقال: صحيح على شرط الشيخين ولم يوافق الذهبي بل قال: (منقطع) قال: وأنقطاعه بين اسماعيل بن عبيدالله وفضالة بن عبيد وقد وصله أحمد (20/6)، وابن ماجة (1340)، والبخاري في التاريخ الكبير (124/1/4)، وابن نصر في قيام الليل (ص 58)، والسمعاني في أدب الاملاء (ص93-94)، وابن حبان (الاحسان 66/2)، والطبراني في الكبير (ج

واتە: لە فوضالەی کوڕی عوبەید لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە ئەوەندە بە چاکی گوێ بۆ پیاوێکی دەنگ خۆش لە قورئان دەگرێ زیاتر لە گۆرانی بێژێك لە گۆرانی‌یەکەی).

(عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم يَقْرَأُ فِى الْعِشَاءِ (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ) فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ )[1].

واتە: (لە بەرائی کوڕی عازەبەوە خوای لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم لە نوێژی خەوتناندا سورەتی (والتین والزیتون) دەخوێند، نەم بیستوە کەسێك دەنگی لەو خۆشتر بێت) .

(عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَتْ: أَبْطَأْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لَيْلَةً بَعْدَ الْعِشَاءِ ثُمَّ جِئْتُ فَقَالَ « أَيْنَ كُنْتِ». قُلْتُ كُنْتُ أَسْتَمِعُ قِرَاءَةَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِكَ لَمْ أَسْمَعْ مِثْلَ قِرَاءَتِهِ وَصَوْتِهِ مِنْ أَحَدٍ. قَالَتْ فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَهُ حَتَّى اسْتَمَعَ لَهُ ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ « هَذَا سَالِمٌ مَوْلَى أَبِى حُذَيْفَةَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى جَعَلَ فِى أُمَّتِى مِثْلَ هَذَا)[2].

واتە: لە عائشەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ شەوێکیان دوای نوێژی عیشا کەمێك لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوا کەوتم ئینجا هاتم.

ئەو -پێغەمبەر- یش گوتی: (لە کوێ بویت)؟

گوتم: گوێ بیستی -قورئان- خوێندنەوەی پیاوێك لە هاوەڵانت بووم کە هەرگیز وەك خوێندنەوەی دەنگی ئەوم لە کەس نەبیستوە !

---

772/18)، والبيهقي في السنن (230/10) ما بين اسماعيل وفضالة ذكر: (ميسرة) مولى فضالة و(ميسرة) قاله عنه الحافظ ابن حجر: مقبول (إذا توبع وإلا فلين)، والحديث كما قال البوصيري في الزوائد (436/1): هذا اسند حسن.

(1) رواه البخاري (7546)، ومسلم (464).

(2) رواه ابن ماجة (1338)، وقال البوصيري في الزوائد (435/1) هذا اسناد صحيح رجاله ثقات. واحمد (165/6)، وابو نعيم في الحلية (371/1) ، انظر فضائل القرآن لأبن كثير (ص 193،192)

عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستاو منیش لەگەڵی هەستام تاوەکو گوێی لێ بگرین.

ئینجا ئاوڕێکی لێ دامەوە و فەرمووی: ( ئەوە سالمی پێش خزمەتی ئەبو حوزیفەیە. سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە کەسێکی وای لەناو ئوممەتم گێڕاوە).

عَنْ أَبِي مُوسَى رضى الله عنه عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ لَهُ: ( يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ )[1].

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریيەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم پێی دەفەرموو: (ئەی ئەبو موسا بە ڕاستی لە دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی داود پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ بەشت دراوە).

وفي رواية مسلم:( لَوْ رَأَيْتَنِى وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ ).

واتە: پێغەمبەر پێی دەفەرموو:(ئەگەر دوێنێ چاوت لێم بوایە چۆن گوێم بۆ قورئان خوێندنەکەت گرتبوو زۆرت پێ خۆش دەبوو، بەڕاستی لە دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی داود پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ بەشت دراوە) .

عَنْ أَبِى مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: « إِنِّى لأَعْرِفُ أَصْوَاتَ رُفْقَةِ الأَشْعَرِيِّينَ بِالْقُرْآنِ حِينَ يَدْخُلُونَ بِاللَّيْلِ وأعرفُ مَنَازِلَهُمْ مِنْ أَصْوَاتِهِمْ بِالْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ وَإِنْ كُنْتُ لَمْ أَرَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نزلوا بِالنَّهَارِ وَمِنْهُمْ حَكِيمٌ إِذَا لَقِىَ الْخَيْلَ - أَوْ قَالَ الْعَدُوَّ - قَالَ لَهُمْ إِنَّ أَصْحَابِى يَأْمُرُونَكُمْ أَنْ تَنْظُرُوهُمْ » )[2].

واتە:( لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((دەنگی کاروانی هاوڕێیانی ئەشعەری لە شەودا کە دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە. بە هۆی خوێندنی قورئانەوە دەناسمەوە،

---

(1) رواه البخاري (5048).

(2) رواه البخاري (4232)، ورواه مسلم (2499).

گەرچی بە ڕۆژیش ماڵەکانیانم نەبینیوە و نازانم لە کوێ دادەنیشن، کەسی دانای وایان تێدایە کاتێ دەگا بە ئەسپ سوارەکان یان فەرمووی: کاتێ دەگا بە لەشکری دوژمن بەبێ پەروا پێیان دەڵێ هاوڕێکانم فەرمانتان پێ دەکەن کە چاوەڕوانیان بکەن ).

((عن حبيب بن ابي مرزوق قال: بلغنا أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَانَ إِذَا رَأَى أَبَا مُوسَى قَالَ: ذَكِّرْنَا رَبَّنَا يَا أَبَا مُوسَى. فَيَقْرَأُ عِنْدَهُ))[1].

وفي رواية:( وكان حسن الصوت بالقران).

واتە: لە حەبیبی کوڕی ئەبو مەرزوقەوە دەڵێ: پێمان گەیشتوە کە عومەری کوڕی خەتتاب جار جارە بە ئەبو موسای ئەشعەری دەگوت: (پەروەردگارمان بیر بهێنەوە! ئەبو موساش کە لە خوێندنەوەی قورئاندا دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو بۆی دەخوێندەوە).

(عن أنس بن مالك رضى الله عنه أن أبا موسى قام ليلة يصلى فسمع أزواج النبي صلى الله عليه وسلم صوته وكان حلو الصوت فقمن يسمعن فلما أصبح قيل له إن النساءكن يستمعن، فقال لو علمت لحبرتكن تحبيراً ولشوقتكن تشويقاً )[2].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لە سەر بێ کە شەوێکیان ئەبو موسا ڕەزای خوای لێ بێ شەونوێژی لە مزگەوت دەکرد و خێزانەکانی پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم گوێیان لە دەنگی گرتبوو.. وەدەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، ئەوانیش هەستان گوێیان بۆ گرت. کە ئەبو موسا بەیانی کردەوە پێی گوترا ئافرەتەکان گوێیان لە دەنگت گرتبوو.

(1) رواه الدارمي في فضائل القرآن باب التغنى بالقرآن (3496).

(2) رواه ابن سعد في الطبقات (345/2)، قال ابن حجر: أسناده على شرط مسلم، فتح الباري (9/93).

ئەویش فەرمووی: ئەگەر دەمزانی ئەوا بەڕاستی چاکتر بۆم دەڕازاندنەوەو زیاتر تامەزرۆم دەکردن و سەرنجیانم بۆ ڕادەکێشا ).

**دوو تێبینی:**

1- تێپەڕاندن لە دەنگ خۆشی:

قورئان خوێن دەبێ لەوە وورياو ئاگاداربێ کە لاواندنەوەو ڕازاندنەوەو ئاوازو دەنگ خۆشیەکەی نەبێتە ئەوەی پیتێك لە قورئان زیاد یان کەم بکات، وەکو لە خوێندنەوەو ئاوازی هەندێك قورئان خوێن گوێ بیست دەبین بەتایبەتی لە پرسەکان کە زۆربەی قورئان خوێنەکان خوێندنەوەیان هەڵەیە، وەکەمیان هەیە ڕەچاوی یاساکانی تەجوید بکەن، وەکو هێنێکیان کە بە ئاوازی فارسی یان هێندێك ئاوازیتر قورئان دەخوێنن لە ووشەی کۆتایی ئایەتەکان (یاء) دەکەنە (یێ) و (واو) دەکەنە (ۆ).

2- دەنگ خۆشی و لە خوا ترسان:

هەرچەندە بە پێی ئەو بەڵگانەی لە ڕابردوو باس کران دەنگ خۆشی سوننەتە، بەڵام دەبێ قورئان خوێن لەگەڵ دەنگ خۆشی و خوێندنەوەی قورئان ترسی خواشی هەبێ.

جابری کوڕی عبدالله ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ صَوْتًا بِالْقُرْآنِ الَّذِي إِذَا سَمِعْتُمُوهُ يَقْرَأُ حَسِبْتُمُوهُ يَخْشَى اللَّهَ)[1].

واتە: (دەنگ خۆشترین کەس لە قورئان خوێندندا ئەو کەسەیە کە ئەگەر گوێتان لە قورئان خوێندنی بێ وا بزانن ترسی خوای لە دڵ دایە).

(1) رواه ابن ماجة (1339) في اقامة الصلاة، باب في حسن الصوت وفيه ابراهيم بن اسماعيل بن مجمع وعبدالله بن جعفر الراوي عنه وهو والد ابن المديني وهما ضعيفان. ب صحيح الجامع للألباني (2202). وللحديث شاهد من حديث عبدالله بن عمر الآتي.

عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال: سئل رسول الله صلى الله عليه وسلم أي الناس أحسن قراءة ؟ قال: (من إذا سمعته يقرأ رؤيت أنه يخشى الله عز وجل)[1].

واتە: لە عبداللەی کوڕی عومەر خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیار کرا کێ لە خەڵکی چاکترین خوێندنەوەی قورئانی هەیە ؟

فەرمووی: ((ئەو کەسەی ئەگەر بیستت قورئان دەخوێنێ وای ببینی کە لە خوا دەترسێ)).

## ئاداب و ڕەوشتی شانزەهەم:

### ئایەتەکان و ووشەکانی قورئان؛ قورئان خوێن دەدوێنێ:

هەست کردن بەوەی کە ئایەتەکان بابای قورئان خوێن دەدوێنێو قسەو گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و ئەرك و فەرمانی ئاراستە دەکات پێویستە،

بەڵێ؛ پێویستە قورئان خوێن لەگەڵ ئەم هەست و نەستەدا بژێ و ژیان بباتە سەر تاکو شوێنەوارو بەرهەمی قورئان خوێندنەکەی لەسەر دڵ و دەروون و جەستەی بەدیار بکەوێ و هەست بە شیرینیو تامی خوێندنەوەکەی بکات، بۆیە پێویستە ئەو کەسە زۆر لەسەر ئایەتەکان بوەستێ تا بزانێ چی لێ داوا دەکات و چی لێ قەدەغە دەکات، بەتایبەتی با ئەو ئایەتانە ڕایبگرێ و بیوەستێنێ کە بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾ دەست پێدەکەن، وەبا هەموو دەرگاو

(1) رواه الطبراني في الأوسط (مجمع الزوائد 173/7). وقال الهيثمي: فيه حميد بن حماد بن ابي خوار وثقه ابن حبان وقال ربما أخطأ وبقية رجاله رجال الصحيح، ورواه البزار في كشف الأستار (98/3)، وابو نعيم في تاريخ الأصبهان (102/2)، ورواه الدارمي مرسلاً من حديث طاوس (471/2) ورجاله ثقات، وصحيح الجامع للألباني (194).

پەنجەرەکانی وەرگرتن و وەڵام دانەوەی دڵ و جەستەیان بۆ لەسەر پشت واڵا بکات چونکە ئەوەی لە دوای ئەمانەوە دێن یا:

1- فەرمانە بۆ جێبەجێ کردنی.

2- قەدەغە کردنە بۆ نەکردن و دوورکەوتنەوە و خۆ لێ پاراستنی.

3- سەرزەنشت و گلەیی و بەبیرهێنانەوەیە.

4- وەیان ئاراستە کردنێکە لە باشەوە بۆ باشتر.

**ئاداب و ڕەوشتی حەڤدەهەم: ڕامان و ووردبونەوە لە ئایەتەکانی قورئان**[1]:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾[2].

واتە:(پەڕاوو و کتێبێکی پڕ خێرو بەرەکەت و بەپیت و فەڕو موبارەکمان بۆت ناردووە، تاکو لە ئایەتەکانی ووردبنەوەو مایەی ووشیاریو دڵ بێداری خاوەن هۆشەکان بێت).

کەواتە:جگە لەوەی کە قورئان موبارەکەو خوێندنەوەی خواپەرستییە بۆ ئەوە هاتووە لە ئایەتەکانی ووردبینەوەو شارەزابین تا سەرەنجام ڕامان و ووردبونەوەمان لە ئایەتەکان لە دڵ و قسەو کاروکردەوەکانمان ڕەنگ پێ بدەینەوە.

برای شاعیریش کاک فرهاد برادۆستی دەڵێ:

کە قورئانت خوێند کەمێ بوەستە
تاکو بزانی چی لێت مەبەستە
هەرچەندە لە قورئان ڕامێنی کەمە
چونکە لابەری گرفت و غەمە

(1) لەبەر گرنگی ئەم بابەتە بە ویستی خوا لە بەرگی چوارەمی ئەم زنجیرەیە لە بەشێکی سەربەخۆدا باسی ئێوە دەکەین.

(2) سورة ص: (29).

**ئاداب و ڕەوشتی هەژدەهەم: کەوتنە ژێر کاریگەری ئایەتەکانی قورئانی مەزن:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾[1].

واتە: (خوا جوانترین وچاکترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە.. قورئانێکە کە ئایەتەکانی لەیەکچووی دووپات کراوەن.. ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پێدادێ بە خوێندنەوە و بیستنی قورئان، پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی خوا کە قورئانە، ڕێنموونی خوایە و بەو ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە خوا بیەوێ، وە هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات ئەوە ڕێنموونیکارێك بۆ ئەو نییە).

لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، وَحَرِّكُوا بِهِ الْقُلُوبَ، لاَ يَكُونُ هَمُّ أَحَدِكُمْ آخِرَ السُّورَةِ)[2].

واتە: (قورئان بخوێنن و دڵەکانتانی پێ جۆش بدەن، هەموو غەمتان ئەوە نەبێ بگەنە کۆتایی سورەتەکە).

کەوتنە ژێر کاریگەری ئایەتەکان بە پێی چەشن و بابەتیان کارێکی پێویستە و دەبێ هەبێت. بۆ نموونە خوێنەری قورئانی مەزن زۆر دڵخۆشە کاتێك ئایەتەکانی موژدە و هیوا و تکا دەخوێنێتەوە، وەغەمبارە و دەگری لەخوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی سەر کۆنەی گوناهباران و باسی سزاو ئەشکەنجەی ستەمکاران دەکات، وەئەگەر ئایەتێکی نیعمەت بەخشی بینی و خوێندییەوە، داوا لە خوا دەکا لە ئەهلی ئەم نیعمەتە بێ، وەئەگەر ئایەتێکی ئێش و ئازاری ڕۆژی سزادانی خوێندەوە خۆی لێ بەخوا پەنا دەگرێ و نزای

---

(1) سورة الزمر: (23).

(2) رواه البيهقي في السنن الكبرى ( 13/3).

پاراستن لەم سزایە لە خوا دەکات، وەئەگەر بە ئایەتێکی سوژدە بردندا ڕۆیشت سوژدە دەبات. وەهەردەم ئامادەیە خۆی کێش بکا بە تەرازووی قورئان و هەموو ئەو ئایەتانەی باس لە سیفاتی ئیمانداران و کافران دەکەن و لەگەڵ هەڵس و کەوتی خۆی بەراووردیان بکات، تاکو لەنگی و کەم و کورتییەکانی خۆی بۆ بەدیار کەوێ و چاکیان بکات. تا بەرەو چڵە پۆپەی ئیمان و تەقوا بچێت، وەبۆ ئەوەی فەرمان و ئەرکەکانی خوای گەورە جێبەجێ بکات و وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە و خۆی دوور بگرێ لە کافران و سیفەتیان و بەرائەتیان بەرامبەر دەربڕێ، وەبۆ ئەوەی ڕوو لە ئیمان و ئیمانداران بێو متمانەیان پێ بکات و خۆشەویستیو یارمەتیو وەلائیان جار دوای جار بۆ نوێ بکاتەوە.

**ئاداب و ڕەوشتی نۆزدەهەم: گریان و فرمێسک ڕژاندن لە کاتی قورئان خوێندن[1]:**

گریان لە کاتی خوێندنەوەی قورئان سوننەتە، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو ئایەتانەی باس لە ئەشکەنجە و دیمەنەکانی دۆزەخ دەکەن. ئەمەش بەوە دەبێ ئەو کەسە ئەم دیمەنانە بهێنێتە بەرچاوی خۆی و وابزانێ خۆی یەکێکە لەو گوناهبارانەی -بێ گومان هەمووشمان گوناهبارین- لەناو ئەو کارەساتە ناخۆش و پڕ لە ناسۆرە دایە و تین و کڵپەی ئاگرەکەش قرچەقرچی بە گۆشت و لاشە و ئێسقانی خستووەو تاماوەیەکی زۆر تێیدا دەمێنێتەوە.

(1) بەویستی خوا لە بەرگی چوارەم لە بەشێکی سەربەخۆدا زیاتر باسی لێوە دەکەین.

**ئادابو ڕەوشتی بیستەم: حوکمی گوتنی (صدق الله العظيم) یان هەر ڕستەیەکی لەم شێوەیە چییە؟**

پرسیار: ئایا حوکمی گوتنی (صدق الله العظيم) لە دوای تەواو بوونی خوێندنەوەی قورئان چییە[1]؟

وەڵام: گوتنی (صدق الله العظيم) لە دوای تەواوبوون لە خوێندنەوەی قورئان بیدعەو زیادەیە ، چونکە ئەم کارە پێغەمبەر-صلى الله عليه وسلم-و خەلیفە ڕاشیدەکان -ڕەزای خوایان لێ بێ- ئەنجامیان نەداوە، هەروەها گشت هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خواش ئەنجامیان نەداوە، لەگەڵ ئەوەی ئەوان زۆر قورئانیان دەخوێندەوە و زۆر لێی شارەزابوون و گرنگیان پێ دەدا، بۆیە ئەم قسەیە لە دوای تەواوبوونی خوێندنەوەی قورئان بیدعەیەکی داهێنراوە، وەلە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە کە فەرموویەتی: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد)[2].

کەواتە: کردنی ئەم کارە بە بەردەوامیو بە سوننەت زانینی بە خستنەسەرو زیادکردن دادەنرێ لە ئایینی ئیسلام ، بۆیە دەبێ ووریابین!

**ئادابو ڕەوشتی بیستو یەك: قورئان خوێن دەبێ خەتمی بەردەوامی هەبێ و نابێ هیجرەت لە قورئان بکات.**

ئیدی لە کۆتایی ئادابە گشتییەکانی خوێندنەوەی قورئان لە وەڵامی ئەوەدا: گەر کەسێك بڵێ بۆچی ئەم هەموو ئادابە ؟

دەڵێین: لەبەرئەوەی قورئانی مەزن فەرموودەو کەلامی خوای گەورەیەو مرۆڤەکان دەبێ لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا بەویەڕی ڕێكوپێکیو جوانی بجولێنەوەو کارێکی نابەجێو ناشایستە ئەنجام نەدەن کە لە خواو

---

(1) بڕوانە: 1- فتاوى اللجنة الدائمة رقم الفتوى (3303). 2- فتاوى علماء البلد الحرام صفحة(414).

(2) رواه البخاري (2697).

فەرموودەکەی نەوەشێتەوەو پێچەوانەی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێ. بۆیە نوسینی ئەم هەموو ئاداب‌و ڕەوشتانە پێویست بوو.

**تێبینی:**

1- سیواك کردن بەر لە قوڕئان خوێندن:

دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر هیچ دەقێکی (صحيح)م لە فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەم بارەیەوە بەدەست نەکەوت. بەڵکو ئەوانەی دەستم کەوتن قسەی چەند هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوا بوون صلی الله علیه وسلم، وەکو عەلی کوڕی ئەبی تالیب خوا لێی ڕازی بێ.

2- دوعا کردن لەدوای خەتمی قوڕئان:

لە چەند ئەثەرێکدا هاتووە کە هێندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەکو ئەنەسی کوڕی مالیك[1] ڕەزای خوای لێ بێ لە دوای خەتم کردنی قوڕئان دوعایان کردووە.بەڵام ئەم کارە بە بەردەوامی نەکرێ باشە[2]. چونکە لە فەرموودەی سەحیحدا نەهاتووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم کارەی ئەنجام دابێ.

---

(1) **بڕوانە:** التبيان في آداب حملة القرآن للنووي(ص 116).

(2) فتاوى علماء البلد الحرام رقم صفحة (1508).

## بەشی پێنجەم

# فەزڵ و گەورەیی دانیشتن و کۆبوونەوە لە مزگەوت بۆ فێربوون و دیراسەکردنی قورئانی بەرز و بەڕێز

دانیشتن و کۆبونەوەی مرۆڤەکان لە گەڵ یەکتری چەند جۆرێکە:

1- جۆرێکیان ئەوەیە کە شەیتانی بێت، واتە لەم مەجلیس و دانیشتنەدا باس باسی خراپەیە و خەڵکان سەرگەرمی گوناه و سەرپێچی کردنی خوای گەورەن.

2- جۆرێکی تریان ڕێگە پێدراوە و ئاساییە، خەڵکان بە چاك و خراپییانەوە ئەنجامی دەدەن، وەکو لە کاتی کڕین و فرۆشتن و بازاڕدا ئەمەش بە مەرجێك هیچ کارێکی بێ شەرعی تێ نەکەوێت.

3- جۆرێکی تریان کە ئەوەی ئێمە لەم باسەدا مەبەستمانە دانیشتن و کۆبونەوەی ئیمانیە، واتە ڕازابێتەوە بە دین و بەرنامەی خوای گەورە و پشك و بەشی شەیتانی تێدا نەبێت.

کەواتە: ئیمان لە شوێن و کۆڕێك زیاد دەکات کە شەرعی و خوایی بێ و دۆست و خۆشەویستانی خوای لێ بێ.

بۆیە ئەگەر بمانەوێ ئیمانمان بەرەو زیادی بچێ و خاوەن ئیمانێکی پتەو بین دەبێ ئامادەی ئەو دانیشتن و کۆڕانە بین کە ئیمانین. کەواتە دانیشتنی ئیمانی بریتییە لەو ژینگە گونجاوەی کە ئیمانی تێدا نوێ دەبێتەوە و گەشە دەکا و بەرەو زیادی دەچێ و هەردەم تییدا زیندوو دەبێ و لە جوڵە و هەناسە ناکەوێت و ئەو شوێن و مەجلیسانە دەگرێتەوە کە شەرعی و خوایی بن و دۆست و خۆشەویستانی خوای لێ بن.

بەڵێ: دەبێ وریا بین لە دانیشتنی شەیتانیدا کە هەردەم ئیمان تێیدا دەپوکێتەوە و لاواز دەبێت. وە هێندێك جاریش بەرەو نەمان و مردنی یەکجارەکی دەچێت. بۆیە ئیمانداری ژیر و عاقڵ پەیوەندی بە مەجلیسە ئیمانییەکەوە دەکا و لە شەیتانی‌یەکە خۆی دوور دەگرێ و پارێز دەکات، ئینجا نەك هەر ئەوەندە بەڵکو خەڵکانی تریش بۆ ئیمانییەکە بانگ دەکا و لە مەترسی و زیانەکانی شەیتانییەکە ئاگاداریان دەکاتەوە.

جا یەکێك لەو دانیشتنانەی کە ئیمانی مرۆڤی تێدا دەگەشێتەوە و زیاد دەکات، دانیشتنە بۆ خوێندنەوە و دیراسەکردنی قورئان لە مزگەوتەکان.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ( مَا مِنْ قَوْمٍ يَجْتَمِعُونَ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَقْرَءُونَ وَيَتَعَلَّمُونَ كِتَابَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلاَئِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ...)[1].

واتە: ((هەر کۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا بۆ خوێندنەوەی قورئانی مەزن و سەرنج دان و وەرگرتنی حیکمەت و ئامۆژگاری‌یەکانی کۆببنەوەو لە نێوان خۆیاندا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و موتالای بکەن ئەوا هێمنی و ئارامی و ئاسایش دەبارێتە سەریان و ڕەحمەتی خوا بە لێشاو دەیانگرێتەوەو فریشتەکانیش چوار دەوریان دەگرن و خوای پەروەردگاریش لەلای خۆی. لای مەلائیکەتەکان باسی ئەو کۆمەڵە قورئان خوێنە دەکات...)).

(عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَنَحْنُ فِى الصُّفَّةِ فَقَالَ: « أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ فَيَأْتِىَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِى غَيْرِ إِثْمٍ وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ ». فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ. قَالَ: « أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ

---

(1) رواه احمد (2.447)، ومسلم (2699)، والترمذي (2945)، وابن ماجة (225).

عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ وَثَلاثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاثٍ وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ»)[1].

واتە: (لە عوقبەی کوڕی عامیر ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: لە هەیوانی صوففە بوین، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان و فەرمووی: (کامتان حەز دەکات هەموو ڕۆژێك سەر لە بەیانی بچێت بۆ شیوی بوتحان[2]، یان بۆ شیوی عەقیق. وە لەوێ دوو ووشتری سەر کۆپارەی قەڵەو بێنێتەوە بۆ خۆی[3]، بەبێ ئەوەی بەهۆی ئەمەوە گوناهبار بێت و دڵی هیچ کەس و کار و خزمێکی لێ بئێشێت؟

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا هەموومان حەز لەوە دەکەین.

فەرمووی: (ئەی ناکرێت هەر یەکێك لە ئێوە سەر لە بەیانی بڕوات بۆ مزگەوت لەوێ دوو ئایەت لە قورئان فێر بێت. یان بخوێنێت کە باشترە بۆی لە دوو ووشتری مێ. وە سێ ئایەت لە سێ ووشتر باشترە بۆی. هەروا چوار ئایەت لە چوار ووشتر بۆی. ئیدی هەروا بژمێرە زیاتری لە زیاتری باشترە).

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: "من غدا إلى الْمَسْجِد لا يُرِيدُ إلا أَنْ يَتَعَلَّمَ خَيْرًا أَوْ يَعْلَمَهُ، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ حَاجٍّ تَامًا حَجَّتُهُ"[4].

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (هەر کەسێك بەیانی بچێت بۆ مزگەوت و هیچ ئامانجێکی نەبێت مەگەر فێربوونی چاکەیەك یا یەکێك فێر بکات ئەوا پاداشتی حاجیەکی بۆ هەیە کە حەجێکی تەواوی کردبێت).

---

(1) رواه مسلم (1336).

(2) دۆڵێکە لە نزیك مەدینە.

(3) بۆ ئەو کات وەرگرتن و دەست کەوتنی ووشترێکی سەر کۆپارەی قەڵەوی سێ شتێکی زۆر بوو، خۆی لە ئۆتۆمبێلێکی باشی ئێستا دەدا.

(4) رواه الطبراني في الكبير (7346) وصححه الألباني.

پرسیار: ئایا حوکمی قورئان خوێندنەوە بە کۆمەڵ لە مزگەوت چیيە ؟

وەڵام: ئەم پرسیارە ڕوون کردنەوەی دەوێت، ئەگەر مەبەست بە کۆمەڵ خوێندنەوەکە ئەوە بێ کە هەموویان بە یەك دەنگ و لەگەڵ یەکتری بیخوێنن، ئەوا دروست نیيە و کەمترین حوکمی ئەوەيە ناپەسندە (مکروە)، چونکە ئەمە لە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لە سەر بێ نەهاتووەو ئەم کارەیان ئەنجام نەداوە، بەڵام ئەگەر ئەمە بۆ مەبەستی فێرکردن بوو ئەوا -إنشاء الله- هیچی تێدا نیيە. وەئەگەر مەبەست بە کۆمەڵ خوێندنەوەکە ئەوە بوو کە هەموویان کۆدەبنەوەو یەکێکیان قورئانیان بۆ دەخوێنێتەوە، یان هەر کەسەو بۆ خۆی دەخوێنێتەوە بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە ئا ئەمە دروستە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (مَا مِنْ قَوْمٍ يَجْتَمِعُونَ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَقْرَءُونَ وَيَتَعَلَّمُونَ كِتَابَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلاَئِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ...)[1].



(1) اللجنة الدائمة، س/4، رقم الفتوى (3304)، وفتاوى علماء البلد الحرام صفحة(1508).

# بەشی شەشەم

## هەوڵدان بۆ زیاتر شارەزابوون لە قورئان

مسوڵمانان پێویستە هەوڵ بدەن بۆ زیاتر شارەزابوون لە شەریعەتی خوا و لە سەریانە ئاینەکەی خۆیان بناسن، چونکە ئێمە وەکو مسوڵمان ئەرکی زۆرمان لە سەر پێویست کراوە و چەندان داواکاریمان ئاراستە کراوە، بۆ نموونە: پەروەردەکردنی خۆمان و خاوخێزان و فێرکردن و هۆگر کردنیان بە ڕەوشتی بەرز، کە هەموو ئەمانەش بە شارەزابوون نەبێ دەستەبەر نابێ و ناتوانرێ ئەنجام بدرێ. چونکە ئەگەر خۆمان فێرنەبووبین چۆن غەیری خۆمان فێربکەین، وە بێگومان ئەوەی شتێکی نەبێ ناتوانێ شتێك بدا.

بەڵێ؛ هەر ئەرك و داواکارییەکی خوای پەروەردگار کە لە سەرمانی پێویست کردووە بەبێ زانیاری و نەشارەزایی ئەنجام بدرێ لە سەری قەرزار دەبینەوە و لە لایەن خواوە لۆمە دەکرێین. وەکو لەم چەند دەقە هەڕەشە ئامێزە دا کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ١٦٩﴾ [1].

واتە: ( ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی لە زەوی دایە بە حەڵاڵی و پاکی – توخنی قەدەغە کراوەکان مەکەون– وە بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بێگومان –شەیتان– دوژمنێکی ئاشکراتانە، بەڕاستی شەیتان فەرمانتان بە تاوان و خراپە پێ دەدات لەگەڵ هەڵبەستنی شتی وا بەدەم خواوە کە نازانن).

---

(1) سورة البقرة: (168- 169).

وەهەروەها دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾[1].

واتە: ( بڵێ: بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەڕام کردووە کە زۆر بەد و خراپن، ئەوانەی کە ئاشکران وە چ ئەوانەی پەنهانن، وە گوناهی حەڕام کردووە. وە دەست درێژی بە ناهەق، وە حەڕامی کردووە شتێك بکەنە هاوبەش بۆ خوا کە بەڵگەی بۆ دانەبەزاندوە، وە حەڕامی کردووە کە بە دەم خواوە شتێك بڵێن کە نایزانن ).

جا بۆ زیاتر زانیاری چەند نموونەیەك لە ژیانی شوێن کەوتوانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە درێغیان نەکردووە و هەوڵیان داوە و هیممەتیان کردووە بۆ شارەزابوون لە قورئان و بەرنامە و شەریعەتی خوا:

شَقِيقُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: خَطَبَنَا عَبْدُ اللَّهِ فَقَالَ وَاللَّهِ لَقَدْ أَخَذْتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم بِضْعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم أَنِّي مِنْ أَعْلَمِهِمْ بِكِتَابِ اللَّهِ وَمَا أَنَا بِخَيْرِهِمْ. قَالَ شَقِيقٌ فَجَلَسْتُ فِي الْحِلَقِ أَسْمَعُ مَا يَقُولُونَ فَمَا سَمِعْتُ رَادًّا يَقُولُ غَيْرَ ذَلِكَ[2].

واتە: شقیقی کوڕی سەلەمە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:( عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ووتاری بۆ داین و گوتی: سوێند بە خوا حەفتاو ئەوەندە سوڕەتەم لە خزمەتی پێغەمبەر خۆیدا خوێندووەو لە دەمی موبارەکی لەبەرکردووە، سوێند بە خوا یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خۆیان



(1) سورة الاعراف: (33).

(2) رواه البخاري (5000).

باش دەزانن کە من لە گشتیان باشتر لە کتێبی خوا تێ دەگەم و شارەزام، لەوانیش چاکتر نیم).

شەقیق (ئەبو وائل) دەڵێ: خۆم لە کۆڕ و دانیشتنی یارانی محمد صلی الله علیه وسلم زۆر دانیشتووم، نەم بیستووە کەسێك ئەم قسەیەی ئیبنو مەسعود ڕەت بکاتەوە و بەنەنگی دابنێ).

(عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ رضى الله عنه وَاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ أَيْنَ أُنْزِلَتْ وَلاَ أُنْزِلَتْ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَ أُنْزِلَتْ. وَلَوْ أَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنِّى بِكِتَابِ اللَّهِ تُبَلِّغُهُ الإِبِلُ لَرَكِبْتُ إِلَيْهِ)[1].

واتە: لە مەسروقەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: عبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ گوتی: ( سوێند بەو خوایەی کە لە غەیری ئەو هیچ پەرستراوی تر نیە. لە کتێبی خوا هیچ سورەتێك دانەبەزیوە کە نەزانم لە کوێ دابەزیوە. وە لە کتێبی خوا هیچ ئایەتێك دانەبەزیوە کە نەزانم لە کوێ دابەزیوە. وە لە کتێبی خوا هیچ ئایەتێك دانەبەزیوە کە نەزانم دەرهەق چی دابەزیوە. وە ئەگەر بە کەسێك بزانم کە بە کتێبی خوا لە من زاناترە و ووشتر پێی دەگات ئەوا دەچووم ).

لە شەعبیەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ لە سەفەرێکدا بە کاروانێك گەیشت کە عبداللەی کوڕی مەسعودی تێدا بوو، عومەر خوا لێی ڕازی بێ فەرمانی بە پیاوێك کرد بانگیان بکات کە ئایا لە کوێ هاتوون؟

عبدالله وەڵامی دایەوەو گوتی لە ڕێگایەکی دوور ( فج عمیق ).

عومەر گوتی: ئەی بۆ کوێ دەچن ؟

عبدالله گوتی: بەرەو ماڵە دێرینەکە ( البیت العتیق ).

---

(1) رواه البخاري (5002) .

عومەر گوتی: ( البيت العتيق ) کەوا بیٚ زانایەکیان لەگەڵ دایە، فەرمانی بە پیاوێك کرد بانگیان بکات: ئایا چ ئایەتێك لە قورئاندا زۆر مەزنە ؟

عبدالله گوتی: ﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۖ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾[1].

عومەر گوتی: بانگیان بکە کە بەهێزترین ئایەت کامەیە ؟

عبدالله گوتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾[2].

عومەر گوتی: بانگیان بکە، کۆکەرەوە (جامع) ترین ئایەت کامەیە ؟

عبدالله گوتی: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ ﴾[3].

عومەر گوتی: پێیان بڵێ ئەی ترسێنەرترین ئایەت ؟

عبدالله گوتی: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلَا يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾[4].

عومەر گوتی: ئەی بە ئومێد و هیوا ترین ئایەت ؟

عبدالله گوتی: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾.سورة الزمر.

---

(1) سورة البقرة: (255).

(2) سورة النحل: (90).

(3) سورة الزلزلة: (7-8).

(4) سورة النساء: (123).

عومەر گوتی: بانگیان بکە ئایا ئیبنو مەسعودتان لەگەڵ دایە ؟

گوتیان: ئەرێ وەڵلا.

(حكى عن الشافعي رحمه الله أنه كان لا ينام إلا سويعات ويقض بقية الليل مضطجعا يفكر في القرآن، ويستنبط منه الأحكام، قال احمد بن حنبل رحمه الله بت عنده ليلة فصليت الى الصبح، واضطجع هو الى الصبح، فاستنكرت ذلك منه، فقام وصلى ركعتي الفجر، فقلت له في ذلك. فقال أظننت أني نمت، كلا، استخرجت من كتاب الله نيفاً ومائة مسألة، فانت عملت لنفسك، وانا عملت للأمة)[1].

واتە:( دەگێڕنەوە شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ: کەمێك لەشەو دەخەوت و زۆربەی جار ئەوەی تری هەموو بە بیرکردنەوە لە قورئان بەسەر دەبرد. وە بە پاڵ کەوتنەوە چەندان حوکم و بڕیاری لە قورئان هەڵدەهێنجا.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: شەوێکیان لەلای مامەوە.. شەو تا بەیانی نوێژم کرد.. ئەویش تا بەیانی پاڵ کەوت. دەڵێ: منیش ئەمەم زۆر لەلا سەیر بوو.. ئیدی هەستا و دوو ڕکات سوننەتی بەیانی کرد، منیش دەربارەی ئەمە قسەم لەگەڵ کرد.

ئەویش گوتی: ئایا گومانت برد کە من خەوتووم ؟! نەخێر سەد و ئەوەندە حوکم و بڕیارەم لە کتێبی خوا دەرهێناوە، تۆ کارت بۆ خۆت کردووە، منیش بۆ ئوممەت ).

( قال مجاهد رحمه الله: أحب الخلق الى الله أعلمهم بما انزل )[2].

واتە:موجاهید ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:(خۆشەویسترین دروست کراو لای خوا زاناترینیانە بەوەی ناردوویەتی ).



---

(1) تنوير الأذهان من تفسير روح البيان للبروسوي (2/335).

(2) تفسير القرطبي (1/26).

وەمێژوو دەربارەی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆمانی گێڕاوەتەوە کە[1]: بوخاری چەندان جار لە ڕووی زەکاوەت و زیرەکی تاقی کراوەتەوە، بەڵام لەبەر زیرەکی و شارەزایی خۆی سەرکەتوو بوە و سەلماندوویەتی کە چەند هەوڵی بێ پایانی داوە بۆ شارەزابوون لە ئایینی خوای گەورە.

ئەوەتا کاتێك لە یەکێك لە سەفەرەکانی لە بوخاراوە بۆ بەغداکە پێشتر خەڵکی بەغدا ناوبانگی ئیمامیان بیستبوو زانایانی فەرمووده کۆبونەوە و گوتیان: هەر دەبێ تاقی بکەینەوە تا بۆمان بەدیارکەوێ زیرەکی و ڕاستی ئەو زانیاری‌یانە چەندە کە دەربارەی ئەو پێمان گەیشتووە و بیستوومانە.

بۆیە زانایان پەنایان بردە بەر ڕێگایەك و هاتن دەق (متن) و سەنەدی سەد (100) فەرموودەیان هەڵاو گەڕاوە و ئاوەژوو و بەروپێشت کرد.. دە (10) گەنجیان هێنا.. هەر یەکەیان دە (10) فەرموودەیان لەم فەرموودانە پێ لەبەرکردن.. وە لە مابەینی بوخاری و گەنجەکان ژوانێکیان دانا و کات و ساتی بەیەك گەیشتنیان دیاری کرد، هەواڵی بەیەکگەیشتنەکەش بە ناو خەڵکیدا بڵاو بوەوە و تەشەنەی کرد.

لە کات و ساتی دیاری کراو گەنجەکان هاتن و هەریەکەیان لە بەردەم بوخاری و جەماوەردا ئەو دە فەرموودەیەی لەبەری کردبوو باسی کرد و هەمووی گێڕایەوە، ئیدی خەڵکان لە مەجلیسەکە کە زانیاریان لە فەرموودەناسی نەبوو سەریان سوڕما لەوەی کە هەر فەرموودەیەك بۆ بوخاری دەخوێنرایەوە، بوخاری دەیگوت: ئەم فەرموودەیەم نەزانیوە و نەناسیوە (لا أعرفه).

بۆیە خەڵکەکە گومانی ئەوەیان برد کە ئەمە کەم و کورتی‌یە لە زانست و زانیاری ئیمام، بەڵام ئەو زانایانەی ئەم تاقی کردنەوەیان ڕێك خستبوو



(1) صور ومواقف لمأمون فزيز جرّار (8/57-79) بە دەستکارییەوە.

گوتیان: ئەم پیاوە تێگەیشت لەوەی ئێمە ویستمان !! ئیدی بەم شێوەیە تاخوێندنەوەی هەموو فەرموودەكان كۆتایی هات.

بەڵام بوخاری هاتە پێشەوەو دوای ئەوەی ئەوان چاوەڕێیان نەدەكرد و بەبیریان نەدەهات ڕوو بدا ڕووی دا، بەڵكو ئەوپەڕی ئەوان گومانیان بۆ دەچوو ئەوەبوو كە بوخاری تەنها فەرمووده ڕاستەكان بڵێتەوە. بەڵام زۆر سەرسام بوون كاتێك بیستیان بوخاری فەرموودە هەڵوگەڕاوەكان یەك بە یەك دەڵێتەوە. پاشان هەر یەك لە فەرموودە هەڵوگەڕاوەكان دەهێنێتەوە باری ڕاستی خۆی.

وەجارێكی تریش لە سەمەرقەند چوار سەد (400) زانای فەرموودەناس لە دەوری كۆبوونەوە. لەمەشدا وەكو ئەوەی بەغدا بە سەركەوتویی دەرچوو.

<u>تێبینی:</u>

هەرچەندە بەسەرهاتی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەڕواڵەتدا پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە قورئانەوە نییە بەڵام دەبێ ئەوە بزانین كە ئەمە بووە هەوڵ و خەبات و كۆششی پیاوچاكان بۆ بەرەو پێش بردن و بەرزكردنەوەی ئەم ئاینە ! خوای میهرەبان هەموویان بكاتە دراوسێی خۆیو ئێمەش بكاتە دراوسێی ئەوان و پێكەوە لە بەهەشت لە فردەوسی بەرز لەلای خۆی كۆمان بكاتەوە.

## بەشی حەوتەم

# دابەزین و کۆبونەوەی فریشتەکان لە کاتی خوێندنی قورئان

ئەگەرچی ئەم بابەتە لە ڕووی واتا و ناوەڕۆکەوە هەر لە چوارچێوەی گەورەیی و فەزڵی خوێندنەوەی قورئان دایە، بەڵام لەبەر بایەخ و گرنگی‌یەکەی بە باشمان زانی لە بەشێکی سەربەخۆدا کۆی بکەینەوە و باسی لێوە بکەین.

فریشتەکان لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی بەڕێز دادەبەزن و کۆدەبنەوە و دەوری قورئان خوێن دەدەن بۆ گوێ گرتن و بیستنی قورئان. چونکە فریشتەکان لە دروست کردنیان چەند تایەبتمەندییەکیان هەیە، لەوانە فەزڵی خوێندنەوەی قورئانیان پێ نەبەخشراوە بەڵکو لە غەیری خۆیان گوێ دەگرن.

موناوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (لان الملائكة لم يعطوا فضيلة التلاوة كما في خبر آخر وانهم حريصون على أستماع القرآن من البشر)[1].

واتە : (لەبەر ئەوەی فریشتەکان فەزڵی خوێندنەوەی قورئانیان پێ نەدراوە بۆیە زۆر پەرۆشن بۆ بیستنی قورئان و داکۆکی دەکەن لەسەر گوێ گرتنی قورئان لە مرۆڤـ).

دیارە ئەمەش ڕێز و فەزڵ و گەورەییە بۆ قورئان خوێن، بۆیە چەند لە خوێندنەوەی قورئان ئازاتر بین گەورەتر دەبین و ڕێزمان لەلای خوای گەورە زیاتر دەبێت.

(عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ وَعِنْدَهُ فرسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ منْها فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى

---

(1) فيض القدير للمناوي (1/412).

النَّبِىَّ صلى الله عليه وسلم فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ»[1].

واتە: بەرائی کوڕی عازەب ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: جارێك لە جاران پیاوێك سورەتی کەهفی دەخوێند، لەو کاتە ئەسپێکیش لەلایەوە بە دوو گوریس بەسترا بووەوە، لەکاتی قورئان خوێندنەکەدا پەڵە هەورێك هاتە سەر سەری و گرتیە خۆی و دەستی کرد بە سوڕانەوە بە دەوری دا و لێی نزیك بوەوە، ئەسپەکەش کە هەست بەمە دەکا ل‌ێی هەڵ دەسڵەمێتەوە. جا بۆ بەیانی هاتە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئەمەی بۆ گێڕایەوە.

ئەو-پێغەمبەر-یش فەرمووی: (ئەوە ئارامی و هێمنی فریشتەی ئاسایش بوون لەبەر بەرەکەتی قورئان داباری بوون).

( عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ قَالَ بَيْنَمَا هُوَ يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَفَرَسُهُ مَرْبُوطٌ عِنْدَهُ إِذْ جَالَتِ الْفَرَسُ فَسَكَتَ فَسَكَتَتْ فَقَرَأَ فَجَالَتِ الْفَرَسُ ، فَسَكَتَ وَسَكَتَتِ الْفَرَسُ ثُمَّ قَرَأَ فَجَالَتِ الْفَرَسُ ، فَانْصَرَفَ وَكَانَ ابْنُهُ يَحْيَى قَرِيبًا مِنْهَا فَأَشْفَقَ أَنْ تُصِيبَهُ فَلَمَّا اجْتَرَّهُ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ حَتَّى مَا يَرَاهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ حَدَّثَ النَّبِىَّ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ « اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ ». قَالَ فَأَشْفَقْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى وَكَانَ مِنْهَا قَرِيبًا فَرَفَعْتُ رَأْسِى فَانْصَرَفْتُ إِلَيْهِ فَرَفَعْتُ رَأْسِى إِلَى السَّمَاءِ فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ الْمَصَابِيحِ فَخَرَجَتْ حَتَّى لاَ أَرَاهَا. قَالَ « وَتَدْرِى مَا ذَاكَ ». قَالَ لاَ. قَالَ « تِلْكَ الْمَلاَئِكَةُ دَنَتْ لِصَوْتِكَ وَلَوْ قَرَأْتَ لأَصْبَحَتْ يَنْظُرُ النَّاسُ إِلَيْهَا لاَ تَتَوَارَى مِنْهُمْ» )[2].

---

(1) رواه مسلم (795).

(2) رواه البخاري تعليقا (5018)، قال الحافظ ابن حجر في الفتح (5:63): وقد وصله أبو عبيد في فضائل القرآن (ص26) عن يحيى بن بكير، عن الليث بن سعد بالأسنادين جميعاً، ورواه مسلم (796)

واتە: ئوسەیدی کوڕی حوزەیر ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئوسەید سوڕەتی (البقرة)ی لە شەوێ دەخوێند مایینەکەشی لە لایەوە بەسترابوەوە کەچی مایینەکەی خول و سوڕانەوەیەکی کرد. ئوسەید بێ دەنگ بوو مایینەکەش وەستا. دووبارە ئوسەید خوێندی، مایینەکەی دووبارە سڵەمییەوە. ئوسەید بێ دەنگ بوو مایینەکە دووبارە ڕاوەستایەوە. دیسان خوێندی دیسان مایینەکەی سڵەمییەوە. یەحیای کوڕی ئوسەید لە مایینەکە نزیك بوو، ئوسەید ترسا کە مایینەکە زیانێکی پێ بگەیەنێ. کە یەحیای ڕاکێشا و لە مایینەکەی دوورخستەوە سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان، ئاسمانی نەدەبینی، ئیدی کە بەیانی کردەوە بۆ پێغەمبەر –صلی الله علیه وسلم– ی گێڕایەوە.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: ( بخوێنە ئەی ئیبنو حوزەیر، بخوێنە ئەی ئیبنو حوزەیر ).

ئوسەید گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا یەحیای لێود نزیك بوو ترسام پێی لێ بنێ، کە سەرم هەڵبڕی وەرگەڕامەوە سەر یەحیا، کە سەرم بۆ ئاسمان هەڵبڕی وەك پەڵە هەور بوو چرای زۆری تێدا بوو کە چومە دەرەوە ئاسمانم نەدەبینی.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ( دەزانی ئەوە چی بوو )؟

ئوسەید گوتی: نەخێر.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ( ئەوە مەلائیکەت بوون لەبەر دەنگی تۆ لێت نزیك بووبوونەوە، ئەگەر بتخوێندبوایە کە ڕۆژت دەکردەوە ئەوا خەڵك تەماشای ئەو فریشتانەی دەکرد و لێیان نەدەشاردرایەوە).

---

من طريقين عن يعقوب بن ابراهيم، عن أبيه عن يزيد بن الهاد عن عبدالله بن خباب، عن ابي سعيد الخدري، عن اسيد بن حضير، برواته: فضائل القرآن لابن كثير (ص 165).

# بەشی هەشتەم

## شوێنەوار و کاریگەری قورئانی مەزن

قورئانی بەرز بەهۆی تین و بەهێزی خۆیو جوانیو ڕێك و پێکی ووشەو دەربڕینەکانی -بەویستی خوا- توانی کاریگەری‌یەکی ئەوتۆ و شوێنەوارێکی وا دروست بکات کە ببێتە جێگای سەرنج ڕاکێشانی دوژمنانی و زیاتر پێوە پەیوەست بوونی دۆستانی.

بەڵێ: قورئانی بەرز کاریگەری‌یەکەی بە شێوەیەکە تەنانەت ئەگەر خوای بەرزو مەزن بۆ کێوو شاخەکان ڕەوانەی بکردبوایەو بۆ سەریان دایبەزاندبوایە ئەوا دووچاری لەرزین و لێك هەڵوەشان و توانەوە دەبوون، وەکو دەفەرموێ: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾[1].

واتە: (ئەگەر ئەم قورئانەمان بۆ سەر کێو و شاخێك بناردبوایە بێ گومان تۆ ئەتدی ئەم شاخە زۆر بە خوشوعەوە پارچە پارچە و وورد و خاش دەبوو لە ترسی خوا، ئەم جۆرە نموونانە بۆ خەڵکی دەهێنینەوە بەڵکو بیر بکەنەوە).

بەڕاستی جێگای سەرنج و ڕامانە کە ئەو شاخە سەخت و بەرز و مەزنانە، ئەو شاخە ڕەگ داکوتا و لە بن نەهاتوانە ئەگەر چی هیچ تەکلیفێکی خواییان لە سەر نی‌یە و بەهەشت و دۆزەخیشیان بۆ ئامادە نەکراوە کەچی لە ترسی خوای پەروەردگار دووچاری وورد و خاش بوون و توانەوە دەبن و دەکەونە ژێر کاریگەری قورئانی مەزن.

---

(1) سورة الحشر: (21).

جا وەکو باسمان کرد قورئانی بەرز شوێنەواری بە جێماوی لە سەر دوژمن و دۆستانی بووە و هەیە و لە داهاتووشتدا هەر بەردەوام دەبێ و دەمێنێ. وەبۆ هەر یەکێك لەو دوو کۆمەڵە چەندان نموونە و بەسەرهات هەن:

**کۆمەڵ و دەستەی یەکەم: شوێنەوار و کاریگەری قورئانی بەرز لە سەر دوژمنانی:**

کاریگەری قورئانی بەرز سەرانی کوفر و تاغوتی لە مەککە و دەوروبەری هەراسان کردبوو، جێیان پێ جێ نەبوو، بە شێوەیەکی وا نەیاندەهێشت هیچ کەسێك لە دەوروبەریان گوێبیستی قورئانی بەرز بێت و لەگەڵ هەڵگرانی قورئان هەڵس و کەوت بکات، ئەوەکو لە چڵکاو خۆری و بەندایەتی ئەوان ڕزگار بن و بەرەو بەندایەتی ڕاستەقینەی خوای گەورەیان بچن. بەڵکو بەلای ئەوانەوە دەبێ خەڵکی هەرچی لە قورئاندایە بە شتی بەتاڵ و کەمی بزانن. وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾[1].

واتە: ( وە کافرەکان دەڵێن گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و لە کاتێکیشدا کە دەخوێندرێتەوە بکەنە دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵب - تاکو کەس خەیاڵی نەچێتە سەر واتاکانی- ئەمەش بۆ ئەوەی ئەگەر ببێتە مایەی سەرکەوتنیان بەسەر ئیسلام و قورئاندا ). بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی دەم ڕاست و سەرانی کوفری ئەو کات[2] بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لە قورئانی بەرز کەچی قورئان کاری کردبوە سەر خۆشیان.

---

(1) سورة فصلت: (26) .

(2) ئێستاش لە زۆر وولات بەردەوام لە هەوڵ دان و ڕێگە بە هەموو کارێك دەدری بکرێ وەکو مەی خواردنەوە و داوێن پیسی و... هتد بەڵام ڕێگە نادری و کۆسپ دەخرێتە بەردەم ئەوانەی ڕوو لە قورئانن.

(شەوێکیان هەر یەکە لە ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان پێش مسوڵمان بوونی و ئەخنەسی کوڕی شەریق لە ماڵی خۆیەوە بە نهێنی هەستا و هات بۆ لای ماڵی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی هەریەکەیان بە نهێنییەوە گوێ لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بگرێت کە لەو کاتەدا نوێژی دەکرد. بێ ئەوەی کەسیان بەوەی تریان بزانێت.

ئەم سێ (3) پیاوەی قورەیش تا بەرەبەیان وەکو پاسەوان هەریەکەیان لە جێیەکدا وەستابوون و گوێیان گرتبوو. بەیانی لەکاتی گەڕانەوەیاندا لێك ئاشکرابوون و کەوتنە سەرزەنشت کردنی یەکتری و بڕیاریاندا کە جارێکی تر کاری وا نەکەن. چونکە ئەگەر خەڵکی بەمە بزانن دەچنە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و مسوڵمان دەبن ئیدی لە یەکتری جیابوونەوەو چوونەوە ماڵەوە.

کاتێك شەو داهاتەوە هەریەکەیان وای دەزانی دەسەلاتی بەسەر خۆیدا نییە و قاچەکانی دەیبەن بەڕێوە. بەرەو شوێنەکەی دوێنێ شەویان. ئەو شەوەش گوێیان گرت و بەیانی دووبارە بەیەك گەیشتنەوە و کەوتنەوە رەخنە و تانە و تەشەردان لە یەکتری.

بەم جۆرە سێ شەو گوێیان گرت و لە بەیانی سێهەمدا گەیشتنەوە یەك و سوێندیان بۆ یەکتری خواردو پەیمانیاندا کە جارێکی تر شتی وا نەکەن.

جا دوای ئەو سێ شەوە کە گوێیان لە قورئان گرت ئەخنەس چووە لای ئەبو جەهل و گوتی: ئەبول حەکەم ڕات چییە بەرامبەر ئەوەی لەو شەوانەدا لە موحەممەدمان بیست ؟

ئەبو جەهل گوتی: ڕام چییە ؟ چیم بیست ؟ ئێمە و بەرەی (عبدالمناف) پێشبڕکێمان دەکرد لە گەورەیی و ڕێزدا. ئەوان میوانداریان دەکرد ئێمەش دەمانکرد. یارمەتی هەژارانیان دەدا و ئێمەش یارمەتیمان دەدان. شتیان دەبەخشی. شتمان دەبەخشی .. تا ئەوان گەیشتنە ئەوەی پێغەمبەریان

هەیەو سروشیان لە لایەن خواوە بۆ دێت، ئێمە نازانین چۆن بەوە بگەین و پێیان بگەینەوە !! بە خوا هیچ کاتێك باوەڕی پێ ناهێنین و شوێنی ناکەوین و بە ڕاستی نازانین. ئیدی ئەخنەس لەلای هەستا و جێی هێشت)[1].

بەڵام خەیاڵیان خاوە و ویستی خوای باڵادەست لە سەروی ویستی ئەوانەوەیە و دەبێ چەند کەسانێکی شایستە ئیمان بهێنن و ببنە هەڵگری پەیامەکەی و تا دوا هەناسەیان ئامادەبن بۆ بڵاوکردنەوەی و چەسپاندنی، با بێباوەڕانیش دەست بار نەگرن و پێیان ناخۆش بێت، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ:﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴿٣٢﴾﴾[2].

واتە: ( دەیانەوێ ڕووناکی خوا بە فووی دەمیان بکوژێننەوە، وە خوا نایەوێ بێجگە لە ڕووناکی خۆی تەواو بکات و سەرکەوێ هەرچەندە بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێت ).

( عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيرَ )[3].

وفي رواية : (.. وذلك أول ما وقر الايمان في قلبي )[4].

---

(1) سيرة ابن هشام قصة استماع قريش الى قراءة النبي -صلى الله عليه وسلم- (315/1).

(2) سورة التوبة: (32).

(3) رواه البخاري (4854).

(4) رواه البخاري (4023).

واتە: لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێش ئەوەی مسوڵمان بم گوێم لە پێغەمبەر بوو صلی الله علیه وسلم لە نوێژی مەغریب سوڕەتی (الطور) ی دەخوێند، جا کە گەیشتە ئەم چەند ئایەتە: ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۜيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ نزیك بوو لە بەر دەنگ خۆشی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بەلاغەت و بەهێزی قوڕئان دڵم بفڕێ.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا: (ئەمە یەکەم جار بوو کە ئیمان جێگیر بوو لە دڵم).

**کۆمەڵ و دەستەی دووەم: شوێنەوار و کاریگەری قوڕئانی مەزن لە سەر دۆستانی:**

ئەگەر ئەوەی لە ڕابردوو باسکرا کاریگەری قوڕئانی بەرز بێت لەسەر دوژمنانی، ئەی دەبێ کاریگەریەکەی چۆن و تا چ ئەندازەیەك بێت لەسەر دۆستانی؟!

جا چۆن وا نابێ، ئەی سەرەنجام و دواڕۆژیان نەبەستراوەتەوە بە ئەندازەی پەیڕەوکردنی قوڕئانی بەرز ؟! ئەی باشە قوڕئانی بەرز ڕۆح و نور و شیفا و ڕەحمەت و فورقان و هیدایەت نیە ؟! ئەی لە بەهەشتدا پلەیان بەرز ناکاتەوە و بەرەو فیردەوسی هاوسێی خوایان نابات ؟! چۆن ئەم هەموو شەرەف و سەربەرزیيە لە دەست خۆیان دەدەن ؟!

بەڵێ، هەموو ئەمانە زیاتر وا دەکەن قوڕئانی بەرز کاریگەری هەبێت لەسەر دۆستانی و بە هەر نرخێك بێت ئامادەبن دەقاودەق بڕیار و فەرمانەکانی لە مەیدانی ژیانیاندا ڕەنگ پێ بدەنەوە، ئەمانەی خوارەوەش چەند نموونەیەکن لە ژیانی دۆستانی قوڕئانی بەرز:

( عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لِعُمَرَ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَزُورُهَا. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ فَقَالاَ لَهَا مَا يُبْكِيكِ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صلى الله عليه وسلم. فَقَالَتْ مَا أَبْكِي أَنْ لاَ أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صلى الله عليه وسلم وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْىَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ فَجَعَلاَ يَبْكِيَانِ مَعَهَا )[1].

واتە: (لە ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: لە دوای مەرگی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەبوبکر بە عومەری گوت: وەرە با بچین بۆ سەردانی ئومموئەیمەن هەروەکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەچووە سەردانی. جا کە گەیشتنە لای، ئومموئەیمەن دەستی کرد بەگریان، ئەوانیش پێیان گوت: بۆ دەگری؟ لای خوا باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم.

گوتی: خۆ من لەبەرئەوە ناگریم کە ئەوە نەزانم، بەڵام بۆیە دەگریم چونکە ئیتر سروش لە ئاسمان نایەتە خوارەوە و بچڕا. کە وای گوت، ئەوانیش دڵیان پڕبوو و لەگەڵیدا دەستیان کردە گریان).

عن الشعبي قال كتب عمر بن الخطاب رضي الله عنه إلى المغيرة بن شعبة وهو عامله على الكوفة ان ادع من قبلك من الشعراء فاستنشدهم ما قالوا من الشعر في الجاهلية والإسلام ثم اكتب بذلك إلي.

فدعاهم المغيرة فقال للبيد بن ربيعة انشدني ما قلت من الشعر في الجاهلية والإسلام. فقلت لقد ابدلني الله بذلك سورة البقرة وال عمران.

قال فكتب المغيرة بذلك إلى عمر. فكتب عمر ان زد في عطاء لبيد خمسمائة.



---

(1) رواه مسلم (2454).

واتە: ( شەعبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ نامەی بۆ کاربەدەستەکەی لە کوفە –کە موغەیرەی کوڕی شوعبە– بوو نوسی و پێی گوت: هەموو شاعیرەکانی لای خۆت کۆبکەوە و داوایان لێ بکە چی شیعریان لە سەردەمی نەفامی و سەردەمی ئیسلامیدا گوتووە بیڵێن و پاشان لە سەرەنجامەکەی ئاگادارم بکەوە.

موغەیرە هەموویانی کۆکردەوە و بە لەبیدی کوڕی ڕەبیعەی گوت: لە شیعرەکانی سەردەمی جاهیلی و ئیسلامی خۆت بڵێ. لەبید لە وەڵامدا گوتی: خوای گەورە و مەزن لە جیاتی شیعر سوڕەتی (البقرة) و (آل عمران)ی پێ بەخشیووم.

موغیرە ئەمەی بۆ عومەر نوسیی و عومەریش بۆی نوسیەوە کە موچەی لەبید پێنج سەد (500) دیناری بۆ زیاد بکا ).

جەعفەری کوڕی سولەیمان ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: لە مالیکی کوڕی دینارم بیست دەیگوت: ( إن الصديقين إذا قرئ عليهم القرآن طربت قلوبهم إلى الآخرة ).

واتە: (ئەوانەی لە باوەڕەکەیاندا لەگەڵ خواو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕاست دەکەن ئەگەر قورئانیان بە سەردا بخوێندرێت دڵیان بۆقیامەت دەگەشێتەوە لە خۆشیاندا ).

( قال وهيب بن الورد: قيل لرجل ألا تنام؟! قال: إن عجائب القرآن أطرن نومي)[1].

واتە: ( وەهەیبی کوڕی وەرد دەڵێ: بە پیاوێك گوترا ئایا ناخەوی ؟! ئەویش گوتی بەڕاستی سەیر و سەرسوڕهێنەرەکانی قورئانی بەرز خەویان لێ ڕەواندومەتەوە و خەو ناچێتە چاوم ).

(1) الدين النصيحة لرعد كامل مصطفى الخيالي (1 /12) .

بەڵێ؛ خواناسان دەیانەوێ تاریکە شەوی ئەنگوستە چاو بە نوری قورئان ڕووناك بکەنەوە و بە پەرۆشن بۆ دواڕۆژیان و شەیدای دیتنی (الله)ن.

(کان أبو حلال العتکي یدعوا دائما حتی في غمرات الموت: اللهم لا تسلبني القرآن)[1].

واتە: (ئەبو حەلال ڕەحمەتی خوای لێ بێ هەمیشە ئەم نزاو دوعایەی دەگوتەوە، تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا هەر دەیگوت: ئەی پەروەردگارم قورئانم لێ نەسەنیتەوە).

خواناسان دەیانزانی قورئانی بەرز خەڵاتێکی گەورەی خوای پەروەردگارەو پڕە لە پیت و فەڕ و پیرۆزی، بۆیە زۆر بە تەنگ ئەوە بوون کاتێك دەمرن و دەگەڕێنەوە لای پەروەردگاریان و لەبەردەمی ڕادەوەستن قورئان تکایان بۆ بکا و لەگەڵیان دابێت.

( قیل لعامر بن عبد قیس: أتسهو في صلاتك ؟ فقال: أو حدیث أحب إلي من القرآن حتی أشتغل به ؟ هیهات، مناجاة الحبیب تستغرق الأحساس )[2].

واتە: ( بە عامری کوڕی عەبدی قەیس گوترا: ئایا تۆ لە نوێژەکەت سەهوو دەکەی؟

ئەویش گوتی: ئایا چ گفتوگۆ و قسەیەك هەیە لام خۆشەویستر بێ لە قورئانی بەرز هەتا سەرقاڵ بم پێیەوە؟! ئەستەمە، ڕاز و نیازی خۆشەویست هەستەکان دادەپۆشێ).



---

(1) صفة الصفوة لابن الجوزي (153/3).

(2) مواعظ ومجالس لإبن الجوزي (ص 212).

لە کۆتایی ئەم بەرگەدا ئەوە ماوە بڵێم ئومێدم وایە ئەوەی نووسیومە بووبێتە ڕازیبوونی خوای گەورە و تویشوی ڕۆژی دوایی و ڕاوەستان لە بەردەم پەروەردگاری بە بەزەییم، پاشان سوودم بە ئێوەی خوێنەری بەڕێزیش گەیاندبێ و هۆی نزیك بونەوەی زیاترتان بێ لە قورئانی پاك و بەپێز.

وصلِ اللهم وسلم على نبيّنا محمد وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمين.

# ناوەڕۆک

# سوپـــاس و پێزانین

- بۆ مامۆستایانی سەنتەری حیکمە کە لە پێداچوونەوەی کتێبەکە ئەرکیان کێشا، وە بۆ ئەو تێبینی و پێشنیارە جوان و ڕێک و پێکانەی لەم بارەیەوە هەیانبوو، وە لەسەرووشیانەوە مامۆستا ئەبوبەکر بەڕێوبەری سەنتەر.
- بۆ برای بەڕێز و شاعیر کاک فەرهاد جەوهەر برادۆستی کە داوام لێ کرد چەند چوارینە شعرێک بۆ هێندێک لە بابەتەکانی کتێبەکە بنووسێ.
- بۆ کاک سەرکەوتی برام کە بە کۆمپیوتەر هەستا بە دانانی ئایەتەکان بەشێوەی موصحەفی مەدینە.
- بۆ هەموو ئەوانەی بە هەر جۆرێک دەست بارو هاوکار بوون و یارمەتیان دام.
- بە هەموو ئەوانەی باسم کردن دەڵێم: خوای گەورە پاداشتی چاکەتان بداتەوەو بیکاتە زەخیرەی قیامەتتان.



# سەنتەری حیکمە

## بۆ فێر کردن و پێ لەبەرکردنی قورئـانی پیرۆز

**پێناسە/** دامەزراوەیەکە هەڵدەستێت بە کاری فێرکردن و پێ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بۆ گشت چینەکانی کۆمەڵگا و هەر هۆکارێك کە یارمەتیدەر بێت بۆ نزیك خستنەوەیان لە قورئان و نزیك خستنەوەی قورئان لێیان.

## لە ئامانجەکانی/

1. گرنگی دان بە فێرکردنی قورئان و چاك خوێندنەوەو لەبەرکردنی.
2. ڕوون کردنەوەو ڕاڤەکردنی ماناکانی قورئان و دەرخستنی موعجیزە زانستی و زمانەوانی و دەروونی یەکانی.
3. چەسپاندن و قوڵ کردنەوەی بنەماکانی ئیمان و حەقیقەتی ئیسلام لە دڵ و دەروونی هەڵگرانی قورئان، ئەمەش لە ڕێگەی دەست گرتن بە ئایەتەکانی و وەستان لە ئاست حوکمەکانی و کار پێ کردنی.
4. ڕاهێنانی زمان و بەهێز کردنی لەسەر شێوازی قورئان و گرنگیدان بە زمانی عەرەبی.
5. گرنگیدان بە تواناکانی مامۆستایان بۆ بەدەست هێنانی مۆڵەت (اجازە) لە خوێندنەوەی ڕاست و دروست.
6. هەوڵی بەردەوام بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی بە بابەتە قورئانی یەکان.

نرخی ( ٢٠٠٠ ) دینارە